

شیرین تاهیر

# باڵانسی ژن لەنێو کاڕێزمای نووسیندا

وەزارەتی ڕۆشنبیری
بەڕێوەبەرێتیی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی
زنجیرە (٥٦٤)



# بلانسی ژن
# لەنێو کاریزمای نووسیندا

شیرین تاهیر

سلێمانی ٢٠٠٨

# بلا نسی ژن
# لەنێو کاریزمای نووسیندا

بابەت: لێکۆڵینەوە

نووسینی: شیرین تاهیر

نەخشەسازی: مەهدی ئەحمەد

نەخشەسازی بەرگ: جەبار سابیر

سەرپەرشتیاری چاپ: کەنعان خەلیل

چاپ: چاپی یەکەم سلێمانی (٢٠٠٨)- چاپخانەی شڤان

تیراژ: ٥٠٠ دانە

ژمارەی سپاردنی(٥٠٨)ی ساڵی ٢٠٠٨ ی وەزارەتی رۆشنبیری دراوەتێ

ناونیشان

بەڕێوەبەرێتیی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی

سلێمانی. گردی ئەندازیاران: ١٠٥ کۆڵانی: ٣٤ ژمارەی خانوو: ١٠

ژمارەی تەلەفۆن: ٣١٨٠٩٩٤

# پێرست

**بەشی چوارەم-**



**بەشی پێنجەم -**

## وتەیەك :ـ

**بــەچــەند پــەیڤێك** دەمــەوێت ئــەوە بەخوێنــەر بڵــێم کەئــەم کتێبــە قولبونەوەیەکی کورتە بەنێو وجودی ژن چ وەك مــەودای کــارکردنی خــۆیی لەلایــەك و لەلایــەکی تریشەوەبەرچــاو ڕوونیەکەلــە مێــژووی ســەرهەڵدانی نووسین دەربارەی ژن وبلانسی ژن لەنێو کاری نووسینداوکار کردنی هونەری لەسەر ئەم بونەوەرە بەرزە .

هەرچەندە زۆربــەمان دەزانــین کــە لــەماوەی ئــەم چــەند ســاڵانەی دوایــدا سەرچــاوەکانی فەلســەفەی هاوچــەرخی خــۆر ئــاوا وئــەدەبیاتی ئەمــەریکای لاتینی بەجۆرێك خۆی هاوێشــتۆتە نێــو چــاپەمەنیی و کتێبخانــەی کــوردی یــەوە کــەناکرێت لەبــەر چــاو نــەگیرێت و بەهەنــد وەرنــەگیرێت ، چــونکە پەلهاویشتن بەرەو فەرهەنگ و ئەدەبی گەلانی دی لەخزمــەتی خــودی ئــەدەب و پەیامەکەیدایــە ، بــەڵام تێبــینی هــەژمار کــراو بۆهاتنــە نــاوەوەی ئــەو سەرچــاوانە ئەوەیــە زیــاتر لــە چوارچــێوەی ژمارەیــەك نووســەری فکــری و فەلسەفیدا قــەتیس بــووە ، هــەر بۆیــە بەلامــەوە گــرنگ بــوو بەشــێوەیەکی تارادەیەك پڕاو پڕقسە لەسەر هەندێك کاری نووسینی ژنان بکەم و هــەروەها باس لەو کارە بەرزانە بکەم کەهەوێنەکــەی ژن بــوە . دەمــە وێــت ئــەوە بــەبیر خوێنەر بهێنمەوە کەهەندێك لەم بابەتانە ووتارن و وزۆربەشیان لێکۆڵینەوەن کاری وەرگێڕانن لەبارەی زاتــێتی وکــاری نووســینی ئــەو ژنانــەوە نووســراون زۆربەیان لەڕۆژنامــەو گۆڤارەکاندا بڵــاو بوونەتــەوە، بەمــەش ئارێتــە بوونێــك هەیە لەنێو مــەخزای نــاوەڕۆکی ئــەم کتێبــەدا ورەچــاوی ڕیزبەنــدی قوتابخانــە ئەدەبییــەکان نەکراوە .

لەسەرەتادا ئەوە خراوەتە ڕوو کەئێستا سەردەمی بزوتنەوەی نووسینی ژنەو تراژیدیەکانی ژنیش بوتە هەوێنی بەئایدیا لیزمکردنی نووسین لای پیاوانی نووسەری یەکسانی خواز ، لەگەڵئەوەی بەشێکی کتێبەکە دەربارەی بەشاکارکردنی هونەرو ئەدەبێکی دەوڵەمەندە لەسەر ژنی نێو مێژوو ( کلیوباترا ) ی شازادەی میسرو کچی بنەماڵەی یۆنانیەکان وهەروەها ژن وەك یەکەم کەرەسەی نووسین لەلای پایە بڵند شانۆنامە نووس وشاعیری یۆنانی ( ئەسخیلیۆس ) ەوە نووسراوە کە هەربە خوێندنەوەی ناونیشانەکەی هەست بەئیلتزامی نووسەر دەکەین کەلە (٤٩١پ.ز) دا ئەو باس لە ژن وکێشە کانی دەکات لەرێگەی ئەم شانۆنامەیەوە، ئاوڕێکی تری سۆزناسی وپەیوەست بوونم بەهاوڕەگەزەکەی خۆم وەك ژن چە مکی ژنەلە هونەری نووسینی ڕۆمان پرشنگدارانی ژن لەم جۆرە هونەرەدا زیاتر ژنە ناودارانی نووسەری ئینگلیزی ( جێن ئۆستن ) کەبەدایکی ڕۆمانی ئینگلیزی دادەنرێت و (جۆرج ئیلیوت ) کەبە شکسپیری ژن هەژمارکراوە و(خوشکانی برۆنتی) کە داینەمۆی ڕۆشنکردنەوەی ئەدەبی ئینگلیزین بەرهەم وژیان وکارە ئەدەبیەکانیان لەخۆ گرتووە .

هەرچەندە ڕەنگە تەواوی کارەکە لەو ئاستەدا نەبێت کەهەست بەدڵنییای تەواو بکەم سەبارەت بەتواناو کاریگەری ئەوان بەسەر ئەو ڕۆژگارەوە چونکە بەڕاستی هەریەکێك لەو نووسەرانە شایەنی ئەوەن بەدەیان وسەدان کتێبیان لەسەر بنووسرێت وبەرهەم و شاکارییان لەزمانە بێگانەکانەوە وەربگێڕدرێتە سەر زمانی کوردی و کتێبخانەی کوردییان پێبرازێنرێتەوەو خوێنەری کوردییان پێئاشنا بکرێت ، بەشێکی تری ئەم کتێبە کاریگەری بوونی ژنە بەشاکاری هونەری پیاوان ئەوانیش ( مارگریت باریسەفنا ڕۆدینکۆ ) سەرسامە بەشاکاری ((مەم وزین))ی ئەحمەدی خانی تێزی دکتۆراکەی لەسەر ئەو باسەبەئەنجام گەیاندووە ، لەهەمان کاتداکاریگەری بوونی هەردوو شاعیرە ( ئەنالیزە بۆنجیۆن وئەلیزابیس

ئـەمۆنتيس دريگـر )، بـە پەيكـەر و كـارە هـەڵكۆ ڵراوەكـانى هونەرمەنـدى ئەڵەمانى ( ئەرنست بارلاخ) بەتايبەتى پەيكەرى(( برسييەكان )) .

دوابەشـيش هەڵبژاردەييـەكى تيـوريـيـە لەسـەرهەندێك لـە ژنـە نووسـەرە هاوچـەرخە مۆديرنيـستـەكان ، بـەهيواى لـەداهاتوودا پرۆژەيـەكى گـەورەتر بۆكارو ئەزموونى ژنـانى نووسـەرى جيهـان دابڕێـژرێت و بەئـەنجام بگـات و كارناسـييان بۆبكرێـت ، بـە هيـوام ئەمـە ڕۆشـناييەك بێـت لـەنێو لاپـەڕە تاريكەكاندا .

نووسەر

شيرين تاهير

# بەشی یەکەم

# ژن گەڕان بەنێو واقع و ئەندێشەدا

هونەرو ئەدەب بەدرێژایی تەمەنی سەرهەڵدانی بەچەند قوناغێکدا تێپەڕی ئەویش قۆناغی قوتابخانەکانی (کلاسیزم ورۆمانسیزم وڕیالیزم )ە ئەدەب وەك لقێکی گرنگی هونەر سەرەڕای ئەوەی بەنێو کایە مەعریفی وئایدلۆژیاو ئێستاتیکادا دەڕوات لەهەمان کاتدا لەنێوان واقع وئەندێشەدا بەرهەمی خۆی دەدۆزێتەوە لەسەرەتای سەرهەڵدانیەوە تائەمڕۆبەهەموو هونەرەکانی دیکەشەوە (شانۆو مۆسیقاو وێنە کێشان وپەیکەرتاشی وهتد...)پڕلەشاکاروداهێنانی جوانی داهێنەران قوتابخانەکانی هونەرقۆناغەکانیان بڕیوە ، سەرەتا کلاسیك لەگریك ورۆمانەوە دەستی پێکرد کەلەژیانی بیروزانست وهونەردا گەورەترین پانتایی داگیر کرد ، لێرەدا باس لەچۆنێتی ناولێنانی قۆناغەکان ناکەین ، دواتریش بەچەند سەدەیەك هونەرلە قۆناغی کلاسیکەوە بەرەو بزوتنەوەی ڕۆمانتیك ڕۆیشت بەهەشتی خۆی لەجوانی وسروشت وخەیاڵ وفراوان تر هونەری نەخشاند لەئاییندەی دەڕوانی تائێستا ی بەچاکترین بگۆڕێ ، سەرەتایی قۆناغی ئەم قوتابخانەیە سەدەی هەژدەیە

بۆهونەرو بۆئەدەبیش کەلەکیکیەتی لەم قۆناغەدا هەریەکە لەئەدیب ونوسەران وشاعیران دەیانویست دەستپێشکەری ئەم ڕێبازە دابشکێنن بەلای ئەدەبی ڕەسەنی نەتەوەکەی خۆیاندا ، ڕابەرانی ڕۆمانتیک کەخۆیان بەرابەری مسۆگەری بەختیاری مرۆڤدادەنا وەك (ووردزوورس وبایرۆن وهۆگۆو گۆتەوشیلەرو پۆشکین )دواتر مەرگی ئەم ڕێبازە دەستی پێکرد لەکوتایی سەدەی نۆزدەدا ئیتر وەك بزوتنەوەزانستییەکانی ئەو سەردەمە ڕیالیزم سەری هەلدا لەهەموو بوارەکانی هونەردا سەرەتا ڕیالیستبابەتی سروشت هەوێنی بابەتەکانیان بوولەوانە (ئەمیل زۆلا ) لەم ڕێبازەدا پەیڕەوی (فلۆبێروتین)ی کردووەکەبەنووسەرانی سروشت واتە (ناتۆرالیزم )ناودەبرێت لەم شێوەنوسینەدا وێنەکێشانی حەقیقەت ڕێ لەبیرکردنەوە دەگرێت کەتوخنی وێنەکێشانەکەی بکەوێت لەهەمان کاتدا پەیوەندی نێوان جوانی ژیان وجوانی هونەر پتەودەکات ، بەئاوێتەبونی (ڕیالیست)لەگەل ڕۆمانتیکدا هونەرێکی تەرپاراودێتە ئاراوە واتە بەپەردە هەلمالین لەرووی حەقیقەت ورازاندنەوەی هونەردەربڕین تێداجەماوەر ڕادەکێشێت بۆتێزیك بونەوەلێی قوڵبونەوە لەکێشەکان دێنەئاراوە .

لەم سەردەمەدا کەسەرەتای سەدەی بیست وبەکە سەردەمی تەکنەلۆژیا لەگەل خۆیدا شتەجوانەکان لەڕۆحی مرۆڤ دەسەنە وە بێنەوەی هەست بەخۆمان بکەین ، دەتوانین ئەم قۆناغەی ئێستابەگواستنەوەی قۆناغێك دابنێین کەزۆرترین ژن دەیانەوێ لەنوسیندا هاوسەنگی بۆپاشخانی ئەدەبی بگەڕێننەوە سەرەڕای هەمووتەگەرەوئاستەنگەکان ، دەیانەوێت لەنوسین نزیك ببنەوە واقیعی خۆیان بە شێوەیەکی نادیار بخەنە سەر ڕووپەری کاغەزێکی سپی ولەگەلێدا ئێشك بگرن واقعی خۆیان بەئەندێشەو وشە دەربڕین لەگەمەی زمانەوانیدا نقوم بکەن ، لەنوسینیشدا جارێکی ترخەیالی ڕاستەقینەیان تۆماربکەن تالەدەرگای ڕوناکییەوە بچنەژووری .

زۆرجاردەرگایەکی گەورەترەوبەبێ بەربەست دەکەونە شوێن ئایدیای خۆیان لەشوێنێکی تایبەتی هونەریدا دەیڕازێننەوە ڕەنگەلەئایندەدا لەپال بزوتنەوە فیکری

وفەلسەفیەکاندا ئێستا بەقوتاغی سەرهەڵدانی بزوتنەوەی ئەدەبی ژنان دابنرێت بەتایبەت نوسینی شیعرو تێکەڵاوبوون بەدنیاکەی .

## ئایدیای شاعیر بەڕیالیزمکردنی تراژیدیەکانی ژن

لەوکاتەوەی هونەرلەخەونی ئێمەدا جێی بوتەوە زیاتر بەمانتایی تراژیدیادا تێپەڕیوە کەمترین مەودای هێشتوتەوە بۆکۆمیدیا ، هەڵبەتە کەدەڵێین کۆمیدیا ئەوەیە کەخۆی لەنێو تەنزێکی ڕەخنەگرانەدا ڕوون بکاتەوە ، چونکە تەنزلەئەدەبدا بونیادێکی گوتارییە جا ئەگەر شیعر بێت یان پەخشان یان چیروك وڕۆمان ، ئەوەی کەزیاتر کۆمیدیا لەتراژیدیا جیا دەکاتەوە لەپاڵ شادی بەخشین ئەوەیە دەربڕینی کۆمیدیانە کەمتر توشی سەرئێشەوگێچەڵ دەبێت وەك لەدەربڕینی تراژیدیانە کەراستەو خۆ ڕووبەڕوی ئەشکەنجەو ئازار دەبێتەوە .

بەر لەوەی باس لەجەوهەری بابەتەکە بکەین کە پەیوەندی قوڵی نێوان ژن وتراژیدیایە ڕەنگە باسەکە زیاتر خۆی لەناسینی ئەو خاڵی پەیوەندییە بدات کەلەنێوان شیعرو ژن یان نوسین وئەو هەستە مرۆڤانەدا کەلە شیعرو چیرۆکدا هەیە هەروەها کاردانەوەی لەزهنی خوێنەردا لەرێگەی بەیەکگەیشتنی خوێنەر لەگەڵ بابەتەکە بەهۆی پردێکەوە کەزمان ودارشتنی هونەری بابەتەکەیە دەردەخات ، تێگەیشتن لەم خاڵی پەیوەندییە پێویستی بەتێگەیشتنی هەبونی کات وشوێن هەیە ئاوەڵا کردنی تراژیدیا یاتەنزورەخنەی کومیدیانە بۆبابەتەکە چ شیعربێت یان چیروك وڕۆمان دەتوانین بەگرنگترو کاریگەرتر وەربگرین .

ئەوەی ناوەوەی مرۆڤ دەگوێزێتەوە گوتنە واتە گوتن بەهەر شێوازێك بێت (ئاسایی یان هونەری )لەتەك هەڵسوکەوتی ڕوژانەی هەر کەسێکدا ڕەنگ دانەوەی ناخ دەردەکەوێت شیعروژانرەکانی تری ئەدەب وهونەر بەگشتی لەنێودەربڕینی ئەوناخزایەدان کەکەسی هونەرمەندیاشاعیر ناخیان دەخەنەسەر پەڕەو ئاشنایەتی بەدەربڕینێکی هونەری دەبەخشن ،

تایبەتمەندی وسەلیقە لەهونەری دەربڕیندا دەرکەوتەی سیمای سەلیقەی هونەرمەندە لەگەڵ بەئەندێشەبونی واقیعدا تێپەڕین بەخەونی ناوازەدا لەودیو نەستەکانەوە هەوێنی هونەرێکی ئەفسوناوی جیاوازتر دێنێتە ئەفرانـدن پەیوەنـدی دیـالێکتی نێوان جـوانی ژبـان وجـوانی هونەر پتەوتر دەکات لەرووی کۆمەڵایەتی ومێژوی وگۆڕانکارییەکانیشەوە واتە هونەرئەگەر کرۆکـی ڕوداوە تراژیدیـەکانیش زینـدو بکاتـەوە هـەر پارێزگـاری لەشـتی جـوان دەکـات وبەفۆنمیەکی زیندووش دەیهێڵێتەوە مرۆڤ لەرێگەی هونەرەوەلەژبان تێـدەگات بـێ هونـەر مەحاڵەتێگەیشتن لەئازارو لەجوانییەکانیش هەربۆیە ئـەو شـاعیرانەی بڕوایـان بەیەکسـانی وئازادی مرۆڤەکان هەیە شـیعری تراژیـدیا ئامێزلـەنۆکی خامەکانیانـەوە پێشـکەش بـەژن دەکەن .

شـــیعرگەرهەرپیبازێك لەفەلســـەفەو زانســـت وبیرمەنـــدی زاڵ بوبێـــت بەســـەریدا ئەواتەوژمێکی ڕۆشنبیری بەسەرییەوەدیارە ، شیعر بەدرێژایی مێژووی خۆی لەنێوگرۆتینی تراژیدیاداسوتاوە یان لەرێگای کۆمیدیاوە خۆی لەشـکاندنی تەوقـەکان داوە لەگەڵئـەوەی کەزاناو ساحیرمشاعیر ! ملکەچی جوانیشە .تەمەنی تراژیدیا لەکۆمیدیا درێـژترە بەپـەنجا ساڵێك پێش ئەو سەری هەڵدا دوای سێ لوتکەی شاعیرانی تراژیدیای یۆنان(ئەسخیلیۆس وسۆفۆکلیس وبۆرپیدس)کەبەدامەزرێنەری شیعروشیعرنامەی تراژیـدیا دەژمێـردرێن دوای پەنجا سـاڵ لەسەردەسـتی (ئەرسـتۆفانیس) شـیعری کۆمیـدیا لـەدایك بـوو ، لەسـەرەتادا کۆمیدیاتەنهالەشیعردا هەبوو دواتر لەهونـەرەکانی تریشـدا جێـی بوتـەوەوجوانترین کـاری ئەنجامداوە .

شیعربۆئەوەی زەمەنێك تایبەت بەخۆی بخولقێنێ واتای تازەوجوانتر بۆخـۆی بدۆزێتـەوە لەگەڵ تراژیدیادا زیـاتر ئاوێتـە بـووە ، چـونکە لەگـەڵ هـاتنی سـەدەکاندا مێـژووی نـوێتر لەتراژیدیا خولقاوە هەرلەو گۆشە نیگایەوە دەکرێت بـاس لەهـەبونی تراژیدیایـەك بکـەین تایبەت بەژن وبونیادی شیعر .ژن خۆی کەمترین مەودای خولقێنـەری تراژیدیایـە ، بـەڵام زۆرترین شوێن وکـات لەتراژیـدیادا داگیردەکـات ، لەواقیعـدا تراژیـدیا ڕوئیـای هونـەری

کەسی هونەرمەندبەنێو قوڵایی فەنتازیاداپەلکێش دەکات ، بەشێوەیەکی ئیستاتیکیانە جوانیەك بەبەر کارەهونەریەکەیدا دەکات تا چاوی بینەر یاخوێنەرزیاتر بۆکارە هونەرییەکەی لەرێگەی خستنە رووی کێشەکانەوە بۆخۆی راکێشێت ، هەر رستەیەك لەدەقێکی شیعری یان چیرۆکێك یان فیگەری پۆستەرێك یاتۆنی پارچە مۆسیقایەك کارێکی واقعین بەلۆژیکیانە حەقیقەتێك دەردەبڕن تازیاتر کەسی بەرامبەر بڕوا بەرێتمی کارە هونەرییەکە بهێنێت .

خاڵێکی نزیك لەشیعرتراژیدیایەبەهۆی ئاوێتە بونی شیعر لەناخداولەدایکبونی شیعر لەرۆحدا بۆخۆی سەنگەرێکی تۆکمەی تراژیدیا هەڵدەبژێرێت تالێوەی ئافەرید بێت ، ئەوتراژیدیانەی بەسەر مێژوودا دێن شیعرلەدیدی خوێنەردا بەجوانی دەیهێڵێتەوە گەرچی لەواقعدا ناشیرین وقێزەونیش بن وەك رِوداو شاعیرتراژیدیابەرۆنیاوزمان و وێنای هونەری دەخاتەرووکەتایبەتدەبنەوە بەناخی شاعیر خۆی .

نمونەی ئەو شاعیرانە زۆرن کەخەون وپرانسیپی ئایدیایەك تراژیدیاکانی ژنیان پێدەکاتە شیعرێکی ریالیزم وشوێن ومەودای زۆربەی شیعرەکانیان داگیر دەکات لەوانە (بۆدلێر )کە پێشەوای قوتابخانەی سیمبولیزمەکانە وبەشاعیری سێبەری رەش ناسراوە شیعری (پشیلەکان) دیارترین شیعری تراژیدیای ئەم شاعیرەیە هەروەها شیعری (بەلقیس ) ی نزار قەبانی وشیعری (عارستان )ی جەمال غەمبارو شیعری (گوڵی هیوا) ی هێمن وسەراپا (گۆرستانی چراکان )ی شێرکۆبێکەس ئاوێتەیەکی راستەقینەی شاعیرە بەتراژیدیا ، گومانی تێدانیەهەموو ئەو شاعیرانەی بونەتەسیمبولی ئەغرانەدنی شیعربۆبرینە قوڵەکان توانای بەریالیز مکردنی تراژیدیا لەچلەپۆپەی شیعرنوسیندادەیانهێڵێتەوە .

# بەشی دووەم
# کاریزمای ژن بەسەر پێگەی هونەرەوە

## کلیۆپاترا ژنی نێومێژوو پاڵەوانی نێوچیرۆکەکان

دامەزراوەکانی بەرهەم هێنانی فلیم بوونەتە هۆی ناوبانگ دەرکردنی ئەم ناوە، هەرچەندە ئەو دەزگاناوەندیانەی فیلمسازیی بازرگانین وەدەیانەوێت رەواج بۆ فیلمەکانیان زیاتربکەن ، راستیە مێژووییەکە لەگەڵ ئەفسانەدا تێکەڵ دەکەن بەشێوەیەك کەرەسەنایەتی لەدەست دەدەن ، لەناوەوەشی بینەردا تەنها ئەفسانە بەرجەستە دەبێت . کلیۆ پاترا شازادەی بنەماڵەی بەتلیمۆسی** یۆنانیەکانی میسر بوو لەدوای داگیرکردنی میسر لەلایەن ئەسکەندەری مەکدۆنیەوە لە٣٣٢ پ ز دواتریش بۆماوەی چەند سەدەیەك لەمیسر دەسەڵاتداربوون بەدرێژیی دەسەڵاتی یۆنانیەکان و بنەماڵە بەتاتلیسەکان خوێندن ونوسین ورێورەسمی یۆنانیەکان جێگەی نووسین وخوێندنی میسریە کۆنەکانی گرتەوە . کەسێکی ناودارو ناسراوی مێژوویی وەك کلیۆپاترای شازادەی میسر چەندی لەسەر نووسراوە بەرادەی ئەوە کەسایەتی و رووداوەکان گۆڕانی بەسەرداهاتووە. چەندان کتێب بەناوەرۆکی جیاواز

لەسەر ئەم بابەتە نوسراوە جاشیعربوویێت یا مێژوویا ڕۆمان یاپۆیەمابوویێت سەنگی خۆیان هەبووە بۆبەرقەراربوونیان لەنێودڵی جەماوەردا . هەرچەندە زۆر بەی خەڵك لەرێگەی تەلەفزیۆن وسنەماوەئەم ژنەناودارەیان ناسیوە ، زیاتر کەسایەتی کلیۆپاترا کەسێکی شۆخ و شەنگ ودلڕەق وعاشق وکەسێکی سیاسی وزیرەك وهۆشیارە لەمەسەلەی پاراستنی دەسەلاّت وقەوارەی دەولّەتەکەیدا بەئەزموون وشارەزایە .کلیۆپاترا لەنێوژنانی مێژووسازی جیهاندا وەك کەسایەتیەکی دیارو وەك ژن ناسراوترین ناوداری مێژوویە ، یەکەمین وبەناوبانگترین ئەوژنەیە بەدرێژایی مێژوولەسەری نووسراوە .لەسەر هیچ ژنێك بەرادەی ئەو پەرتوك وشانۆ نامە نەنووسراوەو بەسەرهاتی ئەوپتر لەهەموو ژنێك هاتۆتە سەر تەختەی شانۆوپەردەی سینەما ، نووسەرانی بەناوبانگی وەك بلۆتارك وشکسپیرویەرناردشۆ لەسەدەکانی رابردوودا بەپێزترین شانۆنامەکانی خۆیان لەسەر بەسەرهات وچارەنووسی ئەوژنە نو سەوەهێشتاش دوای تێپەربوونی چەندسەدەیەك دراماکانی ئەوان لەسەر ژیانی کلیۆپاترا یەکێك لەسەر کەوتووترین درامایەو زۆرترین بینەری هەیە لەئەوروپاو ئەمەریکاشدا [1] .

زۆربەی کات بۆنواندنی رۆڵێکی کلیۆپاترا لەفیلم وشانۆکاندا جوانترین ئەکتەرەکانی سینەماوشانۆ هەلّدەبژێرن وبینەرانی ئەو فیلم وشانۆیانە بەم شێوەیە بیردەکەنەوە کەجوانی ئەفسوناوی کلیۆپاترا هۆکاری سەرەکی کارتێکەری ودەسەلاّتی ئەولەسەر دووسەرکردەی گەورەی ئەوکاتەی رۆما (ژولیۆس سزار) و (مارك ئەنتۆنی ) هەبووە،لەکاتێکدا بەلّگەی مێژووییەکان دەریدەخەن کەکلیۆپاترا جوانیەکەی ئەوەندە نەبووە، هۆکاری سەرەکی کارتێکەری ودەسەلاّتی ئەو لەسەر پیاوانی هاوچەرخی خۆی هۆشیاری زیرەکی وتواناکەی بووە، کەلکی لەخالّە لاوازەکانی پیاوانی سەردەمی خۆی وەرگرتووە ، لەگەلّ ئەو تایبەتمەندیانەشدا سەرنجراکێشی و عیشوەگەری ئەو بووە، لەشێوەی ئەوشتەی کەحافیزی شیرازی لەشیعرەکانیدا بەئەو ناوزەدی دەکات ، دەمێت ئەوەبلّێین کە چەندان خاتوون لەبنەمالّەی بەتلیمۆسەکان هاتوونەتە سەر حوکم سیانیان بەناوی کلیۆپاتراوەبووە کە

بەزمانی یۆنانیدا فلیۆپاترای پێ دەوترا [٢] هیچ کەمیان هیندەی کلیو پاترای حەوتەم ناوبانگی دەرنەکردووە .کلیۆپاترای حەوتەم لەساڵی ٦٨ یان ٦٩ پ.ز لەدیکبووە ئەو کاتەی ئەو لەدیك دەبێت حکومەتەکەیان بەرەو نەمان دەچێ پاشاکانی بەتلیمۆس (پتۆلیمی ) لەدرێژەپێدانی فەرمانڕەواتی خۆیان پشت بەرۆمیەکان دەبەستن ولەژێر فەرمانی قەیسەری رۆمیەکاندابوون .کلیۆپاترا لەتەمەنی لاویدا یەویاکی بەتلیمۆسی سیانزەهەم دەمرێت وبرا بچووکەکەی کەتەمەنی مێردمنداڵەو لەسیانزەساڵیدا لەگەڵ کلیۆپاترادا دەبنە هاوسەر ئەم هاوسەرێتیە لەسەر بنەمای هێشتنەوەی دەسەلاتی تەنهای پاشانشینەیە بۆ بنەماڵەی بەتلیمۆسەکان ، بەتلیمۆسی چواردەهەم کەبرا ومێردی کیلۆپاترایە کەسایەتیەکی لاوازە لەبەڕێوەبردنی ولاتدا ، هەربۆیە کیلۆپاترا بەهۆی بەهێزی کەسایەتیە کەیەوە دەتوانێت دەست بەسەر زۆر بەی کاروبارەکانی ولاتدا بگرێت هەروەها دەبێت ئەوە بوترێت کەشوکردنی خوشك بەبرا لەمیسریە کۆنەکانەوە مابووە وەك نەریتێك .

زۆر لەمێژوو نووسانی سەردەمەکەی خۆی بۆ نموونە پلۆتارکی یۆنانی بەم شێوەیە ئاماژە بەکەسایەتی کیلۆپاترا دەکات ، تواناو ژیری لەفێربوونی زانست وزمانە باوەکانی سەردەمی خۆی بەئەندازەیەك بوو دەیتوانی قسە بەزۆر بەی زمانەکانی لاتینی وعیبری و عەرەبی ئیرانی وحەبەشی کردووە ، ئەمە جگە لەهەردوو زمانی میسری ویۆنانی ل٢٣(٣)

زۆر لەسەر ئەم ژنە ناوداره نووسراوەو وتراوە چ بەشێوەی چیرۆکی ئەفسانەیی بێت چ بەشێوەی رووداوی مێژوویێت ، یەکێك لەپاراوترین ئەو کتێبانەی کە لەدووتوێی رۆمانێکی دوو بەرگیدا (بەرگی یەکەم ) و(بەرگی دووەم ) کەنیزەی شازدەی میسرە لەنووسینی (مایکڵ پێرامۆ)یە وەرگێڕانی کوردیەکەشی عومەر رسول خدر ـ ە، کەتوانیویەتی خۆی لەوەرگێڕانی حرفی بپارێزێت بەزمانێکی پاراو و روون وەریگێڕاوە ، خۆی لەتەمومژوباریکردن بەزمان بەدوورخستووە ، چونکە بابەتێکی وا مێژوویی ئەستەمە لەشێوازی نووسینێکی واداتەمومژوباریکردن بەزمان وەك لایەنێکی هونەری رەنگە زیانی

زیاتر بێت بۆ تێگەیشتنێکی بابەتیانە لەگێڕانەوەی ڕۆمانەکە بەشێوەیەکی ئاڵۆز بکەوێتەوەو هەر زووخوێنەر بێزار بکات و وەلای بنێت ، بەلاّم وەرگێڕی کوردیەکە توانیویەتی سەرکەوتوانە وەرگێڕانەکەی لەڕووی داڕشتنەوە بەئەنجام بگەیەنێت .

تەنانەت ناوی کەسایەتیەکان وەك خۆی لەشوێنی ماناوداڕشتندا جێی کردوونەتەوە وەك (بەتلیمۆیی) بە(بە تلیمۆس ) داناوە زۆر بەی کاتیش لەزۆر جێگاداناوەکان بەبێ دەستکاریی وەك خۆی ماوەتەوە .گەر لەڕووی ناوەرۆکەوە بڕوانینە مەغزای ئەو کتێبە ئەوا کتومت هەماهەنگی لەنێوان ڕاستەقینە ڕووداوە مێژووییەکان وبابەتی ئەم ڕۆمانەدا هەیە چ وەك کەسایەتیەکان بەگۆڕینێکی کەمەوەیان وەك ڕووداوکانیش بێت ، شایەتی بۆئەمەش ئەوەتا لەکتێبی مێژووی (ژن لەسەر تەختی دەسەلاّت ) ی نووسەر محمود تلوعی هەمان باس بەشێوەیەکی مێژوو یی ئاوەلاّ دەکات ، یان لەکتێبی ( نساو رائدات ) ی ئەمیلی نەسروللا بپشت بەستن بەهەرددسەرچاوەی (ئەنتونی وکلیوپاترا) ی شکسپیرو (مجموعە هارفارد الکلاسیکیە ) ی بلوتارك هەمان کەسایەتی کلیۆپاترا ی حەوتەم بۆت یەکێك لەژنەناودارەکانی سەدەکان لەجیهاندا .

ئەگەر ئەم سەرچاوانە نەبوایە لای خوێنەر ڕەنگە گومانی هەبوونی ژنێکی لەو شێوەیە تەنها بەئەفسانە دابنرایە ، خودی ڕۆمانی (کەنیزە ی شازادەی میسر)ی مایکل پیرامۆ بەچاوێکی ئەفسانەوە بخوێنرایەتەوە ، هەرچەندە جیاوازیەکی ئەو تۆ لەنێوان ئەم ڕۆمانەونووسینەوەی مێژووەکاندا نیە سەبارەت بەکلیۆپاترا.

تەنها جیاوازییەك کەبەدی بکرێت ئەوەیە ئەم کتێبە لەڕێگەی شرمیۆنی ڕەش پێست کەنیزەی کلیۆپاتراوە دەچێتە نێو گێڕانەوەی ڕووداوەکانەوە لەڕێی گرێچنی ڕۆمانەوە، کارەکتەرەکانی لەنێوڕۆمانەکە بە کلیۆپاترا شەوە تەنها لەڕێگەی شرمیۆنەوە دەناسین سەرجەم ڕووداوەئاڵۆزەکانی ئەو سەردەمەو پێشتر یش هەر لەزاری ئەوە وە دەبیستین ، بەلاّم لەکتێبی (ژن لەسەرتەختی دەسەلاّت ) یان هەرکتێبێکی مێژوویی ترکەکەسایەتێك یان ڕووداوێکیان پێ ئاشنا دەکات کەسێکی وەك مێژوونووس خۆی کلیۆپاترا وڕووداوە

مێژوویـیـەکانمان پـێ دەناسـێنێ. گەرپگەرێینەوەبۆ یـەکێک لەوبنـەماداب ونەریتانـەی میسریەکان کەلەکۆندا پـەیڕەویان کـردووەو لـەزۆر بـەی سەرچـاوەکاندا نامـاژەی پـێدراوە دەبوایە ماف ودەسەلاتی پاشایی کچ لەگەڵ کوری گـەورەی پاشـای کۆچـکردوودا دابـەش بکەن ، پاشایەتی هاوبەشی کیلۆپاترا وبرابچوکوکوی بەتلیمۆسی چواردەهەم تاسـالی ٤٩ پ.ز درێژی کێشا ، تائەوکاتە داروەدستەی براکەی کلیۆپاترا بۆ بەدەسـتە وەگرتنـی جلـەوی دەسەلات دژی کلیۆپاترا پیلانیان گێڕاوە کەلەدەسەلات دووریخرێتـەوە ، ئـەوە بووکلیۆپـاترا دوای ئـەوەی هـەولی کوشـتنی دەدەن بـەخۆی سـوپایەکەوە دەچێتە سـوریا ل ٢٤(٤) ـ ل٤١(٥) ، هەولی کلیۆپاترا بۆگەرانەوەی بۆسەر دەسـەلات هاوکـات بـووە لەگـەڵ شـەری دەسەلات لەرۆمادا لەنێوان ژولیـۆس سـیزار پۆمپیـدا لەشـەرێکدا کەلـەنێوان هێزەکـانی سـیزارو پۆمپیـدا روویـداوە ، پـۆمپی شکسـت دەخـواو رۆمـا بەجێـدەهێڵێت ودەچـێتە ئەسکەندەریە ، بەلام کەسانی دەسـت و پێوەنـدی بـەتلیمۆس بـەپیلانێک سـەری پـۆمپی دەبرن کاتێک سیزاردەگاتە میسر پاشای میسر وەك دیاریەکی بەنرخ سەری بـروای پـۆمپی لەسەر سینیەکی زێرین دادەنێ پێشکەش سزاری دەکـەن بـەم کـارە سـیزار زۆر نارەحـەت دەبێت لەبەتلیمۆسی پاشای میسروبراو مێـردی کلیۆپـاترا چـونکە دەیـەوێت بەزینـدوویی پۆمپی بگرێت بیکا بەرەمزی سەرکەوتنێکی تر لەبەر چاوی خەلکی رۆما .

کلیۆپاتراش کەخاوەنی سوپاو دەستوپێوەندی خۆیەتی لەم کاتەدا نەیاری مێردەکەیەتی لەفەرشێکدا هەلدەگیرێت وەك دیاریەك بۆسیزار دەبرێت بۆ ناوکۆشـکی پاشـایەتی میسـر کەئەوکاتە سیزا لەلایـەن پاشـای میسـرەوە لەکۆشـکدا پێشـوازی لیکـراو وەك میوانێـك کۆشکی بۆ بەجێهێلراوە ، کلیۆپاترا لەگەڵ کرد نەوەی فەرشەکەدا لـەپێش چـاوی ژولیـۆس دێتە دەرەوە بەسەر کەش وزیرەکیەکەی سەرسام دەبێت .

لەرۆمانی پیرامۆدا بەرلەعاشقبوونی سـیزار بـەکلیۆپاترا لەسـەرەتادا لەگـەڵ ئـەنتۆنی سـەرداری رۆمدا دۆست وئاشنایە دواتریش لەگەڵ (کال) دەبێتە دۆسـت کەیەکێکـە لـەلاوە سوار چاکەکانی یاری سێرك وکورێکی لێ دەبێت ودواتر ئەم مـنالـەی کلیۆپـاترا کەپاشـای

میسر وا هەست دەکات لەوە لەلایەن کالەوە دەبرێت وهەر بەکورپەیی منداڵەکەی دەمرێت ، هەرلەبەر ئەمەشە پاشای میسر بڕیاری کوشتنی کلیۆپاترا دەدات ودواتریش لەکۆشك دووری دەخاتەوە ، تائەو کاتەی سیزاردەگاتە ئەسکەندەریە ولە کۆشکدا دەمێنێتەوە ل ٢٢٣

(٦) ئەمە دەبێتە فرسەتێك بۆگەڕانەوەی کیاۆپاترا بۆناو کۆشك وسیزار بەرەو عەشقی خۆی رادەکێشێ ، لەئەمیش کورێکی دەبێت ودواتر لەتەمەنی مێرد منداڵیدا دوای لەناوچوونی پاشانشینی میسر بەدەستی رۆمیەکان ونەیارەکانی سیزار دەکوژرێت ل ٢٧(٧)-ل١٧٦(٨) .

لەم رۆماندا ئەم رووداوانە شەن وکەوی زیاتر کراون تا لەکتێبە مێژووییەکەی (محمود تلوعی) چونکە لێرەدا تەنها خودی کلیۆپاترا ومەعشوقەکانی پەردەیان لەسەر لادەبرێت . بەپیلانێك دوای گەڕانەوەی سیزار وکلیۆپاترا بۆ رۆما ، لەکۆبوونەوەی پەرلەماندا سیزار دەکوژرێت ، بەهۆی ئەو رکەبەریەی لەنێوان خوازیارانی جێنشینی سیزاردا دروست بوو ، سێنای رۆما بەناچاری سێ کەسی بەجێنشینی سیزار دانا کەبریتی بوون لە ئۆکتاڤیان ومارکۆس ئانتۆنیۆس و لیپیدۆس ل ٢٨(٩) دوای ئەوەی ئیمپراتۆری رۆما بۆفراوانکردنی ئیمپراتۆریەکەی شەڕ لەگەڵ ئەشکانیەکاندا هەڵدەگیرسێنێت بەهۆی ئەوەی کەدەستدرێژیان کردۆتە سەر سنوورەکانی رۆما ، مارك ئەنتۆنی وەك سەرکردەی ئەم شەڕە دەستنیشان دەکرێت ، کلیۆپاترا بانگهێشتی مارك ئەنتۆنی دەکات کەدەرفەتیکی نوێیە بۆ داگیرکردنی دڵی سەرکردەیەکی رۆمی هەربۆیە بەهێزێکی گەورەی دەریاییەوە چووە بۆ بینینی ئەو سەرکردە رۆمیە تا هێزوتوانای دەریایی خۆی پیشان بدات .

بەرلەمردنی سیزار هێزودەسەڵاتێکی ئەوتۆ بۆکلیۆپاترا گەڕایەوە کەبووە جێی نیگەرانی خەڵکی رۆما ، لەبەرئەوەی لەلایەك سیزار بۆ خۆشەویستی کلیۆ پاترا زۆربەی داهاتی وڵاتی رۆما وهێزێکی تەواوی لەخزمەتی ئەودا دانابوو لەلایەکی تریشەوە

کلیۆپاترای دەرباز کرد لەپیلانی بەتلیمۆسی پاشای میسر بەوەی کەسیزار بی سەروشوێن دەکات .

ئیستاش دەیەوێت سوودلەئەنتۆنیۆ وەربگرێت بۆدەست بەسەرداگرتنی جیهان کلیۆپاترا دەزانێ کەمارك ئەنتۆنی پێویستی بەیارمەتی وهاورێیەتی ئەو هەیەو لەلایەکی تریشەوە بەیارمەتیدانی سەرکردەیەکی رۆمی لەو لەشکرکێشیەو مسۆگەرکردنی سەرکوتنی ئەولەو شەڕەدا شانسی ئەو لەبەدەستەوەگرتنی جڵەوی دەسەلات وەك جێنشینی سیزار زیاتر بکات ، یەکەم چاوپێکەوتنی کلیۆپاترا لەگەڵ مارك ئەنتۆنی جیاوازترە لەبینینی یەکەجاری لەگەڵ سیزار دا ئەوسا تەمەنی بیست ساڵ بوو لەبەردەم پیاوێکی ٥٢ ساڵی وەك سیزار دابوو بەڵام کاتی بەدیداری ئانتۆنی دەگات تەمەنی بیست وپێنج ساڵە ژنێکی تێگەیشتووترە ، بەگەورەی وشکۆیەکی بەرچاوەوە بەپاپۆرێکی تایبەتەوە دەچێتە سەردانی ئەنتۆنیۆ هەرچەندە لەرۆمانی ناوبراودا ** پێشتر ئەنتۆنیۆی ناسیوە ئەوکاتەی کە کلیۆپاترا شارەزایی وپسپۆری خۆی بەکار دەهێنێت بۆداگیرکردنی دڵی ئانتۆنیۆ فیلۆڤیا ژنی ئانتۆنی دوای رۆیشتنی مێردەکەی بۆ رۆژهەلات لە رۆما دەهێنێتەوە دەنگوباسی پەیوەندی مێردەکەی لەگەڵ کلیۆپاترادا دەبیستێتەوە ، نامەیەك بۆ بالیۆزی رۆما دەنووسێ لەمیسر داوای راستی رووداوەکان دەکات ، ئەویش بەروون وئاشکرا باسی پەیوەندیەکەی نێوان کلیۆپاتراوئەنتۆنیۆدەکات .کلیۆپاترادوانیەکی کوروکچی دەبێت لەئەنتۆنیۆ، کورەکەی ناوناوە ئەسکەندەر هیلیۆس واتە هەتاو، کچەکەشی ناوناوە کلیۆپاترا سێلینی کەهێمایەك بووە بۆ بەرزەفڕی شاژنی میسر وئاواتەکانی بۆ گەیشتن بەدەستەلاتداریتی جیهان ل ٣٠(١٠)-ل٦٢٨(١١) .

ئەنتۆنیۆ ناتوانێ وازلەعەشقی کلیۆپاترا بهێنێت نە لەبەرامبەر ژنەکەی خۆی نە بۆخوشکی ئۆکتاڤیۆش ، چونکە بەتەواوی دەکەوێتە ژێر رکێفی عەشقی کلیۆپاتراوە بەرێوەرەسمێکی شکۆ مەندانە لەبەرامبەر چەند مەرجێکی قورسدا شووکردن بەئەنتۆنیۆ قبول دەکات ، دوژمنایەتی کردنی رۆمیەکان وهەڵگەڕانەوەیان لەئەنتۆنیۆبەرامبەر بەو

پەیوەندیەی لەگەڵ شاژنی میسردا بەستوویەتی ئەنتونیۆ بێ یارمەتی وپشتیوان دەمێنێتەوە لەشەڕدا لە رۆژهەلآت ، بەوشەوە ناوەستن رۆمەکان هێرش دەکەنە سەرمیسروتەواوی ولآت خاپوور دەکەن و کلیۆپاترا بەهۆی شکستخواردنی مەملەکەتەکەیەوە بەژەهری مارێکی بچووك خۆی دەکوژێت کەلەوپێش ئامادەی کردووە ، لەتەمەنی ۳۹ ساڵیدا بەدەستی خۆی ماڵئاوایی لەژیان وکیژیکییەکانی دەسەلآت دەکات ل٥٢(١٢)سەبارەت بەتەمەنی مردنی هەندێ سەرچاوە بە٣٨ ساڵ دایدەنێن ٣٩(١٣) .

دیارە ئەنجامی مردنی کلیۆپاترا لەزۆربەی سەرچاوەکاندا وەك یەکە پێدەچی لەزۆربەی سەرچاوەکاندا پشت بەکتێبی (سەرگوزشتە) ی پلوتارکی نووسەری یۆنانی بەسترابێت .

کلیۆپاترا :

ئەگەر ئەوخۆشەویستیە راست بێ پێم بڵێ چەندە

ئەنتۆنی:

چەندهەزارە ئەوخۆشەویستیەی کەرەنگە بەچەند حسێب بکرێ

کلیۆپاترا :

سنوورێك دادەنێم خۆشەویستی لێ بووەستێ ل١٨١(١٤)

ئەنتۆنێ وکلیۆپاتراشرمێون لەشانۆنامەکەی شکسپیردا بوونی هەیە ئەنتۆنی خۆی لە کلیۆپاترا جیادەکاتەوە ودەگەرێتەوە رۆما وژنهێنانێکی رێکوپێك وبەرژەوەندیانە سازدەکات ، ئەنتۆنیۆ دەجەنگێ نەك دژی خۆی ، بەلکو لەپێناوی ئەوەی جیهان بخاتە ژێر دەسەلآتی خۆی جارێکی دی دەگەرێتەوە میسر وبەتەواوەتی دەشکێ ، کلیۆپاترا حەزدەکات لەلای خۆی بیهێڵێتەوە هەمووداهاتەکانی بۆتەرخان دەکات وهەمووتوانایەکی تاقی دەکاتەوە ، ئەوئازاو ترسنۆکە ، کاتێ پێویستی وەفادارە و ئامادەیە بۆناپاکی کردن ، ئەگەر بتوانێ خۆی بەقەیسەری نوێ بفرۆشێ وبەرامبەر دەربازکردنی پاشانشینیەکەی .

ڕەنگە ئەمە بگەڕێتەوە بۆئەوەی کەسە درامیەکانی شکسپیر سەربەستی وبەستنیان نیە . مێژوو داماڵڕاونیە کەرەستەیەکی زانستیە ، لەشانۆگەریەکەی شکسپیردا کلیۆپاترا دەیدۆڕێنیٚ هەروەك چۆن ئەنتۆنیۆ دۆڕاندی ، کلیۆپاترا لەگەڵ سۆزەکەیدا شەڕەکە نادۆڕێنیٚ ، بەڵکو وەك شاژنێك دەیدۆڕێنیٚ ، ئەو تەنها دەبێتە دیلی قەیسەری نویٚ و بەشداری لەسەر کەوتنیدا دەکات ، بەوەی کەتیا جوانترین شتە . لەلای شکسپیر ئەنتۆنی وکلیۆپاترا پاش شکاندنی لەشەڕەکاندا بڕیار لەسەر دواوەستی خۆیان دەدەن ، وەستێکی ناچاری ، ئەنتۆنی وکلیۆپاترا لەبەشی چوارەم وپێنجەمی شانۆییەکەدا دەبن بەدوودڵداری مەزن وبەرزوبەناوی حوکمکردنی جیهانەوە قسە دەکەن ، بەڵاّم لەکۆتایی شانۆگەریەکەدا ئەوبابەتەی کە لەپێشەوە بەدی دەکەین بچووکتردەبێتەوە ، زەوی وئاسمان جێگەی خۆشەویستی ئەم دوانەی تێدانابێتەوە ، کەواتە ئەم کارەی شکسپیر هەمان ئەنجامی ڕۆمانی ناوبراوی هەیە ** *شەرمیۆن بەم چەند وتەیە خوداحافیزی ومالّئاوایی لەشازەدەکەی دەکات وەك کەنیزەیەکی بەوەفا کەدەڵێت : شانازی بکە ئەی مردن بەخۆتەوە کەئێستا دەبێتە مولکی جوانترین ژن "(١٥)ل٥٣ .

پەراوێزەکان :

*بەتلیمۆس /پتۆلیمی-Ptolemy

** ڕۆمانی کەنیزەی شازادەی میسر (بەرگی یەکەم )-مایکل پیرامۆ

*** ڕۆمانی کەنیزەی شازادەی میسر (بەرگی دووەم )-مایکل پیرامۆ

سەرچاوەکان:


١- محمودتلوعی ، ژن لەسەرتەختی دەسەلات ل٢٤/ و.ئەبوبەکر مەجیدی .

١. املی نصرالله ، نساو رائدات (١)ل٤٠/

٢. محمودتلوعی ، ژن لەسەر تەختی دەسەلات ل٢٣ و/ ئەبوبکر مەجیدی

٣. هەمان سەرچاوە ل٢٤.

٤. املی نصرالله ، نساورائدت (١) ل ٤١.

٥. مایکڵ پیرامۆ ، کەنیزەی شازادەی میسر (بەرگی یەکەم) ل ٢٢٣ و/عومەر ڕەسول خدر.

٦. محمودتلوعی ، ژن لەسەرتەختی دەسەلات ل٢٧ و/ئەبوبکرمەجیدی .

٧. هەمان سەرچاوەی (٦) ل١٧٦ .

٨. هەمان سەرچاوەی (١) ل٢٨.

١٠- هەمان سەرچاوە ل٣٠ .

١١- مایکڵ پیرامۆ ، کەنیزەی شازادەی میسر(بەرگی دووەم) و /عومەر ڕەسول خدر.

١٢- هەمان سەرچاوەی(٢) ل٥٢.

١٣- هەمان سەرچاوەی (١) ل٣٩.

١٤- یان کوت ، شکسپیرهاوچەرخمانە ل١٨١ و /کەمال غەمبار.

١٥ - هەمان سەرچاوەی (٢) ل٥٣.

# تراژیدیانامەو ئافرەتە پاراوەکانی ئەسکیلیۆس

هونەروریزەوی مرۆڤایەتی دووشتی یەك گیانن ولەیەك کاتداتواونەتەوە،کەس گومانی لەوەنیەکەرابردووی دوێنێ ئێستای هێنایەکایەوە ئێستاش سبەینێ ئەمە زنجیرەیەکی بەهێزوبەردەوامە،ئارنەست فیشەر دەڵێت(هونەرلەتەك مرۆڤداهاتوە تاچاکتروباشتر لەجیهان بگات و بیگۆرێت ).[1]

زۆرن ئەونوسەرانەی هونەر لەبۆچونەکانیانداهەریەکەیان بەشێوازێك پێناسە یان بۆداناوە هیگڵی فەیلەسوف جوانی لەهونەردا راستەوخۆ دەبەستێتەوە بە هەستەوە دواتریش بنەماکانی دەباتەوە سەر گیان (الروح) لەنوسینێکدا دەڵێت (مەبەستێکی هاوبەش لەنێوان هونەرو ئەورودواوە گیانیانەدا هەیە کەلەدواندنی هەستەکاندا دیاریدەدەن بۆ هەستەکان وریاکردنەوەو جوڵاندنیان )دووجاردەڵێت (بۆیەهونەرهاتوەتە دی تاهەست بەجوانی کردن تیاماندا بەئاگابێتەوە ).[2]

ئەوهونەرانەی بە بەرهەمی زیرەکی ناوبراون(Artsliberaux)ئێستابەهونەرە جوانەکان دەناسرێت (Beausarts ) دەتوانین خانووکاری (الليعماري-Archittcur)وهونەری پەیکەرتاشین (النحت-Sculpture) وهونەری نیگار کێشی (الرسم Peintare)هونەری پلاسیك کاری (التشكيليه-Plastiques)وهونەری خامەکاری (الادب والشعر-Litterature)وهونەری مۆسیقا(الموسيقى-Musique)وهونەری دراما(المسرح-Drama) وهونەری سەمایوێنەیی (الباليه Ballct)وهونەرە سەربەستەکان (Lcsarts Libcraux) لەچاخەکانی ناوەراست بریتیبوون لە (گرامەر رەوان بێژی،لۆژیك ماتماتیك،

ئەندازیاری مۆسیقا خەلك[٣]) هونەرە جوانە کان بەوە وەسف کراون کە زادەی هەڵقوڵاوی ئەوئارەزوانەیە بۆبەرهەمهێنان بەرێبازێکی تایبەتی بەر لەهەموو شتێك لە پێناوی چەشنی تامێکی خۆش وسەربەخۆ دوورلەسودبەخشینی ڕاستەوخۆ

کە لەجێبەجێکردنی ئەو کارانەدا هەست پێدەکات بۆ دووەم جاریش لە پێناوی ئەو خۆشیەداکەلەبینینی بەرهەمی خەڵکی تراهەستی پێدە کات هونەربەگشتی بەچەند قۆناغ و شەپۆلێکدا بەرێبازی کلاسیزم وهۆمۆنیزم لەسەردەمی ڕێنیسانسدا پاشان رۆمانسیزم وریالیزم لە ماوەی ئەم چەند قۆناغ و ڕێبازانەداشەپۆلو تەوژمی لاوەکیش هەبونو ڕەنگ دانەوەیان لەهونەرداهەبوو وەکتەوژمی (سیمبولیزم –Symbolism )و (پەرناسیزم-Parnassism)و (ئیمپرێشینزم-Impressionim) و (تەعبیریەت-Expressionism)و (کوبیزم-Cubesim) (دادایزم-Dadcsim )و (سیریالیزم-Sarrialism)وئەبستراکتیزم-Abstrationism)لەگە لئەمارندا گەلێکی ترومك(ڕۆشنکاری EnilqhtmentF)و (وجودیەت-Existantalism) وچەندینی تر .

لێرەدا ئەوەی زیاتردەمانەوێت شرۆڤەی بکەین بەسەرهەڵدانی تراژیدیانامەی قۆناغی کلاسیزم وشانۆی( ئافرەتەپاراوەکان –ی ئەسکیلۆس Aischylos).

بەشەکانی چیرۆکی تراژیدیا

یەکەم شت کەتەماشاکاران دە بیینن لەشانۆی یۆناندا هاتنی تیپێکی گۆرانیە وەك شتێکی پێشەکی بابەتی نێوچیرۆکەکە بەکورتی دەردەبرن وناوەرۆکەکەی دەست نیشاندەکەن ئەم کورت کردنەوەیەیی دەوترێت (پرولجس-Proloqos)

واتە پێشەکی یان کەسێکدەیکات پێی دەڵێن( المنولوجس) یان گفتوگۆیەکە لەنێوان دووکەسدایە یان شاعیرو درامانوسەکە ڕۆڵەکە دەداتە خاتونێك کەلەشێوەی گۆرانیدا روداوەکان دەگێرێتەوە کەئەم پێشەکیە تەواوبوو کێژەکە دەچێتەدرێژای بابەتەکەوە بەشێوەی

بەشاخشـانە شـيعرى ليركـى ئـەم برگەيەپێيـدەلێن(پـارادۆس Parados )واتەگۆرانيـەك تايبـەت بەشـوێنێك پاشـان چـيرۆكەكە بـەكردارى دەسـت پێـدەكات لەنێوبەشبەشـى چـيرۆكەكاندا دەسـت بـەگۆرانى وتـن دەكاتـەوە بەچـيرۆكەكان دەوتـرا (ئيپزيـۆن Epeisodion)واتـە بـەش بـەگۆرانى نێـوان چـيرۆكەكە دەوتـرا (سـتازيمۆن-Stasimon) وكۆتايى بەشى تەمسيليەكەش پێى دەوترێـت(رەـزۆدوس Exodos)واتـە كۆتايى يان ئەنجام . ئەرستۆ بەم شێوەيە لەكتێبى (هونەرى شيعردا) بـاس لەتراژيديانامـە دەكـات :(تراژيـديا بريتيـە لەگێرانـەوە، مەزنـە فەرمانێكى تەواودرێژيەكيـديارى هەيبـەزمانێكى رازاوە، بەچەشـنەها رەنگـى جـوانى ، دەگۆرێـت بـەپێى پارچـەكانى ئـەم گێرانەوە يەش لەرێگاى كەسانێكەوەيە فەرمان دەكـەن نـەك لەرێگـەى حەقايـەت كردنـەوە ترس وبـەزەيى دەبزوێنـىَ وپاكژبوونـەوە بەدەست دەهێنێـت ) هـەروەها لەبەشـێكى تـرى كتێبەكەيدا بـەم شـێوەيە بـاس لـەگرێى روداووخوورەوشـتى پالەوانەكـەى دەكـات باسـى مەعقولى رووداوو پالـەوان دەكـات ،لاى وايـە دەبێـت لـەبون وخـەلكى نێوژيـان بچـێت ، رەوشـتى چـاك بێـت ولەهەلەونەزانينـەوە تووشـى دەردوبـەلا بێـت نـەك لەتاوانكردنـەوە ئەمانەوگەلێ هۆ شتى دى تا بتوانىَ ترس وبەزەيى ببەزێنىَ وئاكام بەدەست بهێنێـت [4]

ئەرسـتۆ تـاليس بەسـەدەونيويەك دواى سـەردەمى سـىَ مەزنـە تراژيديانووسـەكەى گرێـك(ئەسـكيلۆس وسـۆفۆكليس ويۆرپيـدس) ئەمـەى سـەبارەت بەتراژيـديا نووسـيوە لـەكتێبى (هونـەرى شـيعردا) .لەسـالى ٥٢٥ پ.ز لەگونـدى ئەليۆسـيس سەربەناوچـەى ئەتيكا كەكەوتۆتـە سـەرووى رۆژئـاواى ئەسـيناوە لـەدايك بـووە.لـەخێزانى ئەرسـتۆقراتى ئيپارترديە Euoatrides لەزنجيرە هوزەكانى يۆلينيە Eolicnnes كۆچيان كـردووە بۆئـەتيكا كاتێـك بـوون بەدەولـەتێكى بـەهێز. ئەسـكيلۆس داهێنـەرى تراژيـدياى يۆنانـە زۆربـەى دراماكانى بەشێوەى چيرۆكە شيعرى پياهەلـدانن ، هەرچـەند دەلێـت (مـن دەمـامكێكم نەكردووە لەوەى لەميزى هۆميرۆس دەكەوێتە خوارەوە) واتـە هـەرگيز شێوەنووسـينى مـن لەهۆميرۆس ناچێت ، شوێنى ئاينى وپەروەردەوگۆشكردنى ئـاينى كـارى لەئەسـكيليۆس

کردووە کەزۆربەی جارباس لەتواناودەسەڵاتی خواوەندەکان دەکات ،لەیەکێ لەچیرۆکەکانیدا کەلەسەر باسی منداڵی شاعیردەدەوێ دەگێڕنەوە کەگوایە رۆژی لەرۆژان کاتی ئەسکیلیۆس بەدیار رەزێکی باوکیەوە ئیشك دەگرێ (دیۆنیزیۆس) ی خواوەند پەیدا دەبێ وپێی رادەگەیەنێت دەست بداتەتراژیدیا نووسین ، ئەم چیرۆکەش بەهۆی ئەو تواناوبەهرە بەرزەیە لەتراژیدیاکانیدا دیویانەو بەکاریکی خواکردیان زانیوە، قارەمان وپاڵەوانی ئەفسانەیی سەرگوزشتەکانی بەتان وپۆیەك تەنیوەوچنیوە کەپڕە لەنهێنی وحەپسان .

دەربارەی فێربوون وخوێندەواری ئەسکیلیۆس بەسەرنجدان لەشانۆنامەکانی دەبینیت پەروەردەبوونی ئەو لەبنەماڵەی ئاینی وئۆرستۆکراتیەکەی وایکردووە گۆشەگیری پەروەردەیەکی ئاینی بێت ، ئاگاداری داستان وئەفسانەکانیەتی ، لەناخی نهێنیەکانی گەیشتووە ،لەجەنگی بەرگری نەتەوەکەیدا بەشداری کردووە بەتایبەتی بەرامبەرهێرشی فارسەکان بۆسەروڵاتەکەی وەك جەنگی (مارسۆن وسلامسین وبلاتیا ) هاوبەشیەکی ئازایانەی کردووە بەرامبەر سوپاکەی داریۆسس وئەکسراکیسی پادشاو لەشکری فارسەکان ، ئەورووداوانەیدەگەڕێنەوە بۆساڵانی (٤٩٠ ـ ٤٨٠ ـ ٤٧٩ )پ.ز ئەم لاپەڕانەی ژیانی زۆر بەئاشکرا لەبەرهەمەکانیدا رەنگی داوەتەوە بۆ نموونە شانۆنامەی فارسەکان کە هەمیشە شانازی پێوەکردووە وپێی ناسراوە . دەستپێکردنی ژیانی ئەدەبی شاعیردەگەڕێتەوە بۆتەمەنێکی هەرزەیی واتە لەتەمەنێکی بچووکەوە دەستی بەشیعر وشانۆنامە نووسین کردووە ئەسکیلیۆس یەکێکە لەسێ مەزنە تراژیدیا نووسەکانی یۆنان(ئەسکیلۆس وسۆفۆکلیس ویۆرپیدس)لەپێنج سەدەی پێش زاینیدا بەشاعیرانی رێبازی کلاسیزم وداهێنانی تراژیدیانامەناسران . ئەوەی سەبارەت بەئەسکیلۆس دەوترێت کاتێ سۆفۆکلیس هاتە پێشەوەوکەوتە ناو مەیدانی نووسینەوە ناوبانگێکی پەیداکردو بووە خاوەنی جەماوەرێکی زۆرتر، ئەمە ئەسکیلیۆسی نیگەران کردولەلایەکی ترەوە پەیدابونی (سیمۆندیس ) وەك جەنگاوەرێکی ئازاکەپلەیەکی بالاتری بەدەستهێنا بەتایبەتی لەشەڕی(ماراسۆن) دا گەڵێك شتی ترهەن بەڵام ئەوەی زیاترلەراستیەوە نزیکە ئەوەیە

ئەسـکیلیۆس نـەگونجاوە لەگـەڵ ئـەو رژێمەنوێـیەی ئەسـینادا کەدەسـەڵاتداربووە هـەروەها شاعیری کۆمیـدیا نـووس (ئەرسـتۆفانیس Aristophan)لەشـانۆنامەی بۆقـدا لـەکاتی چـەژنی (لینیابـا) کەخـەریکی ئاهـەنگ گێـڕانن ئەوناکۆکیـە بـاس دەکـات ، سـەبارەت بەمەرگی ئەسکیلیۆس دەیان چیرۆك هەیە دەربارەی دەسـت نیشـانکردنی سـاڵی مـەرگی شـاعیر، چـەند رایـەکی جۆراوجـۆر هەیـە هەنـدێکیان دەستنیشـانی ٤٥٧ پ.ز کـردووە، کەسانی دیکەی وەك مێژوونووسی شانۆ(ڤیتۆپاندولفی Vitopandolfi)[٥] رایـان وایـە کەساڵی ٤٥٦پ.ز کۆچی مەرگی کردبێ ، هەروەها پانـدۆلفی پەنجەی باسـی بـۆکێلی گـۆڕی شـاعیر راکێشـاوە کەئەسـکیلیۆس بەدەسـتی خـۆی نووسـیویەتی : تیانووسـراوە (ئەسکیلیۆس) ی کوڕی ئۆرفۆریۆنی ئەسینایی لەژێرئەم کێلەدا راکشاوە لەجیلای بـەپیت وفەرپـەنااکامی مـەرگ گەیشـتووە ، لـەبارەی ئازایەتیـەوە ئاشـکرایەو چـاك دەزانـێ جەنگەڵستانی (ماراسۆن) ئاگادارەو گەوهیدەرە هەروەها فارسەپرچ درێژەکانیش .

خەڵکی شاری جیلا زۆر بەرێزەوە دەیانڕوانیە ئەسکیلیۆس هەمیشـە بەپیرۆزوگـەورەیان دادەنـا ، کـاتێکیش سـەری مـەرگی نایـەوە گـەلێك بەرێزوخۆشەویسـتیەوە ناشـتیان ، لیکۆرجـۆس گوتاریـژی ئەسـینایی هـەروەك چـۆن پەیکـەری شـانۆی شـاری ئەسـینا بۆ(سۆفۆکلیس ویۆریپیدس) دانا بەهەمان شـێوە پەیکەرێکیشـی لـەبرۆنزبۆ ئەسـکیلیۆس دانا، هەروەها ئەنجومەنی گـەل بڕیاریـدا هـەر کاتێـك شـانۆنامەیەکی پێشـکەش بکرێـت دەبێت گڵۆانکـەی سـەربەرزی سـەرکەوتنی خـەڵات بکرێـت ، هـەروەك زیندوویـەك کـاری لەگەڵدا بکرێت لەهەمان کاتدا ئەنجومەن بڕیـارێکی دەرکردبـەوەی لەهـەر شـانۆنامەیەکی ئەم شاعیرەو شاعیرانی تریش ،بپیارێزن ئەوەك لەئەوەك لەفاوبچێت یان دەستی دەستکاری وتێکدان بیشێوێنێ چونکە بەمیراتێکی بەنرخ وپیرۆزی نەتەوەکەیان دادەنـا . ئەسـکیلیۆس لـەریزی فەیلەسـوفەکانی سـەردەمەکەی خۆیدایـە وەك (هیراکلیدوپارمبیدوزەینەفونـدا) هەرچەندە تێکەڵاوی نـەبوو, لەگەڵیانـدا گـرنگترین بەرهەمـەکانی کەماونەتـەوە ئـەو سـێ چـیرۆکەن کەباسـی خێزانـی ئۆدیـب دەکـات (لایـوس-Laius)و(ئۆدیـب-

Edipe)و(حەوتەکەی گەمارۆی تیبەیان Thebes          Les sep         )دا
لەگـــەڵ (ئۆرســـتا Oretie) و(ئاگامـــەمنون Agamemnon)و(ئۆمینـــدیس-
Eumenides) ە (فـارس-Prses)و(ئافرەتـە پاڕاوەکـان-Les sappliantes) ە.[٦]
ئەسکیلیۆس لەمەودوای شیعردا گـەلێك بـەرووبومی هەبوو بۆنموونـە گـەلێك ساتێرنامەی نووسیوە لەبابـەتی ئەپیگرامیشـد Epigramme دەسـتێکی بـاڵای هەبووکـەبرێتی بـوو لەچەند پارچە شیعرێك بۆ گەیاندنی واتا ومەبەسـتی سـەرەکی بەرهەمـە ئەدەبیەکـە روون کەرەوە بوو، ئەسکیلیۆس لەبواری شانۆدا دووەم ئەکتەری لـەدوای تیسـپس پێگەیانـد کـە( سیکنۆگرافیا) بوو نـەوەت شـانۆنامەی هـەبوو تێکـەڵ لەتراژیدیانامـە و سـتێرنامە (پیـا هەڵدان) بەڵام ئەوەی ماوەتەوە گەیشتوون حەوت شانۆوتراژیدیانامەیە . (ئافرەتە پاڕاوەکان – Les sappliantes ) ئەم شانۆنامەیە بەکۆنترین بەرهـەمی ئەسـکیلیۆس دادەنرێـت ، کۆرسـیش زۆر بەی زۆری شانۆناکەی داگیر کردووەو زۆربەی رووداوە شانۆییەکان لەئەسـتۆی ئەواندایە ، واتە ئەو کۆرسـەی کەبریتییـە لەپـەنجا کچـی هـەڵهاتوو زۆر بـەی بەسـەرهاتەکە دەگێڕنـەوە ودەگەیـەنن، ئەگـەر بێتوبـەراوردی ئـەم بەرهەمانـەی بکـەین بـەو بەرهەمەنـەی کەماونەتەوە پێمان گەیشـتوون بۆمـان دەردەکـەوێ سـادەترە بەچاو بەرهەمـەکانی تـری شاعیردا واتە بەتەواوی هەنگاوی سەرەتایی شـاعیری پێـوە دیـارە لەلایـەکی تـرەوە رووداوە دراماییـەکانی کـەم وبـێ هێـزن ، لەچـەند بینراوێکـی کەمـدا نـەبێت نیـە، رای زۆر بـەی رەخنـەگران ومێژوونووسـانی دراماوایـە کەئـەم شـانۆنامەیە لەدەوربـەری سـاڵی ٤٩٢-٤٩١پ.ز داپێشـکەش کراوەبـەڵام ئـەوەی جێگـەی سەرسـوڕمانە لەسـاڵی ١٩٥١ ز نووسراوێك دۆزراوەتەوە لەشاری بەهنسە مێژووی نووسینی ئـەم شـانۆنامەیەی بـە٤٧١ پ.ز داناوە ، واتە پانزەساڵ بەرلەمەرگی شـاعیر، شـانۆنامەکە سەرگوزشـتەکەی بـەم شـێوەیەیە دووبرا هەبوون کەلەولاتی میسردا دەژیان (ئیجیپتۆس ) یـان پـەنجا کـوڕی هـەبوو، ئـەوی تریشیان( دانـاوس )پـەنجا کچـی هـەبوو کـوڕانی ئینجیپتـۆس دەیانوسـیت بـەزۆرەملێ کچەکانی داناوس مێردیـان پێبکـەن ، بەناچـاری باوکـە وکچـەکانی هەڵـدێن وروودەکەنـە

ئاراگۆسی وولآتی گریك ، شانۆنامەکەبەگەیشتنی پەنجا کچەوباوکیان بۆ کەناری ئاراگۆس دەست پێدەکات ، خۆیان هاویشتووەتە پەرستگا پیرۆزەکەی پەرستاکای زیۆسی مەزنە خواوەندەوە نزاو پاڕانەوەیانە ، داوای بەدەنگەوەهاتنی لێ دەکەن ، تاکو دالدەبدرێن وەك پەناهەندە وەربگیرێن ولەدەستی دڕندانەی ئامۆزاکانیان بیانپارێزێت .لەسەرەتاوە بەسروودی سەرەتایی واتە (پارودۆس Prodos) دەستپێدەکەن ، لەم سەرەتایەوە ئاگاداری حاڵیان دەبین هاتن وهۆی هەڵهاتەکەیان ئاگاداری ئەوەش دەبین کەلەنازی کەسایەتی هاو نەژادیەکەوەیە روویان لەو ولاتە کردووە . ئەم شانۆنامەیە رەنگدانەوەی کۆمەلگای ئەوسەردەمەی گریکەکانە هەرچەندە لەرووی شارستانی وفەرهەنگیەوە پێشکەوتوو بوون ونەتەوەگەلان هەلهێنجاوی شارستانیەتەکەی ئەوانن بەلام دەکرێ خاوەنی کەلتورێك بووبن بۆیە لەڕوانگەی کۆمەلآیەتیەوە گەربڕوانینە ئەم شانۆنامەیە کۆمەلێك دابونەریتی باوەخسەڵەتن وژنانیش لەو کۆمەلگایەدا زاتی ئازادیان نەبووە هەروەك لەیاسای خۆرهەلآتی وهۆزایەتیدا ئەمە چەسپاوبووە بەدرەنگ گۆڕان وکرانەوەی بینیوە هەرچەندە لەخێزانی پاشاو بەتلیمۆسەکاندا زۆر جار کچە کانیان جێنشینیان بوون بەهۆی هۆکارێك کەرەنگە بوونی کوڕێکی مندالْ یان هەرکوڕیان نەبووبێت ئەوجا ئەو عەرشی پاشایەتیە بۆ کچەکانیان بەجێماوە ، شتێکی باو تریش کەهەر لەناوئەم خێزانی پاشاو بەتلیمۆسانەدا هەبوو ئەوەبووە دەبوو کچەکانیان لەکوڕی خۆیان ماربەبڕن واتە خوشك وبرا دەدرانە یەکتر تاکو میراتی وکۆشك وخەزێنەکانیان چنگ خەلکی ئاسایی یان هەرکەسێکی ترکەئەگەر بەدرێژایی تەمەنیشی لەخزمەتی پاشادا بووبێت نەکەوێت . پاشان دەست بەگێڕانەوەی داستانەکەی (ئایۆ) دەکەن ، ئایۆ داستانێکی دێرینی گریکیەو میسریەکان وگریکیەکان بۆسەر نەژادێك دەباتەوە ، چەند جارێك ولەچەند شوێنێکدا ئەم بەسەرکردنەوەوپەرخستنەوەی تیادا بەسەردەکرێتەوە (پیلاگۆس-Pelasqus)ی پادشای شاری ئاراگۆس پەیدادەبێت ولەحاڵیان دەپرسێ ولەکێشەکەیان دەگات ، ئەم پاشایە وەك پاشاکانی تری گریك لەکارێکدا پەیوەندی بەئاسایشی ولآتەوە هەبووبێت دەبووپرس بەئەنجومەنی گەل بکات

ورایان وەربگرێت ، کەواتە بۆجێبەجێکردنی داواکاری کچە کـان پـرس بەئەنجومـەنی گـەل دەکات ئەوانیش داواکە قبوڵ دەکەن وکاتێك کەکورەکانی داناوس دەگەنە ئـاراگۆس پادشـا داکۆکی لەکچەکان دەکات وناهێڵێـت ئامۆزاکانیـان ئازاربـان بـدەن گـەلیش کۆمـەکیان لێدەکەن وبەناوات ونیازەکەیان دەگەن .

کۆتایی شانۆنامـەکە بەسرودی کۆرس دێتەوە ، سروودەکەش لـەبارەی مـەزنی وتوانـای دەسەلاٌتی زیۆسـی مەزنـە خواوەنـدەوە یـە، سـوپاس وشتایشـی دەکـەن وبەچـەند پەنـدێك کۆتایی دێ لێرەدا بەنموونە ئـەو کۆتاییـە سـروودە تۆماردەکـەین :(هـەمووان ئەبرایزیۆسـی بـەزێن ، ئـەو زیۆسـەی بـەهێزی بەبەزەییـەوە بەچـاکی (ئـایۆ)ی لـەئازارەکانی رزگـارکرد ، بەدەستە چـاکەوەکەرەکانی وەك جـارانی لێ کـردەوە خۆزگـە دەی پاراسـتم لەشـووکردنی نەویست ، شووکردنێ بـەمێردێك کـەرقم لێیـەتی ئەریـا سـەرکەوتن بەکۆمـەڵی ئافرەتـان ببەخشی ، ازیم بەوەی لەخراپە چاکترە تەنانەت ئەگەر دووبەش چاکە لەتەك خراپێکیشـیدا بێت ، هەروەها بەنوێژەکانمەوە رازیم یاساکان لەپێناوی چاودێری دادپەروەریدا بێت ، بـەپێی ویست وئارەزووی ئاسمان پای سەرفرازیدا [7] ).

لەم شـانۆنامەیەدا ئەسـکیلیۆس باسـی گـەورەیی وئازایـەتی وتوانـای گـەلی گریـك دەکات ، لەپەنا رووداوە شانۆییە کەوە بـۆ چـەند جارێـك ئـاوڕی لەداسـتانی ئایۆداوەتـەوە ، لەتەك ئەم کارە گرنگەداچەند تەنگوچەڵەمەیەکی کۆمەلاٌیـەتی ورەوشـت وکـاری رامیـاری خستووەتەروو ، لەگەڵ ئەمانەدا دژبەئەرێتی بـەزۆر بەشـوودان وەسـتاوە وبـەکارێکی چـەپەڵ وچەوت ودزێوی دادەنێ ، لەهەمان کاتدا ئافەرین لەیارمەتیدانی لاوازولانەوازولیقـەوماوان دەکات هەروەها داوای پرس ورا بەگەل کردن دەکات ، بەتایبەت لەو کاتانەدا کە پەیوەندی بەکێشەیەکی گرنگەوە دەبێ ، لەگەڵ ئەوانەشدا زۆر بـەی رەخنـەگران لـەو رادەیـەدان کەئـەم شـانۆنامەیە کەسـی قارەمـانی چـیرۆکی وشـانۆیی تێدانیەبـەواتا تەواوەکـەی واتـا بـەواتا ئەرستۆیەکە هەروەها لـەململانێی گـەورەورووداوی گـرنگ خاڵیـە تـەنها ململانێکـە لـەو رووبەڕووبوونەوەیەدایە کەلەنێوان نێردراوی میسریەکان وپادشای ئەرەگۆسدا روودەدات [8]

**پەراوێزەکان :**

١- ضرورة الفن –ارنست فيشر ت/اسعدحليم

٢ - المدخل الى علم الجمال –هيغل ت/ جورج طرابيشى

٣- مشكلة الفن د.زكريا ابراهيم

٤- فن الشعر –ارسطوطاليس ت/عبدالرحمن البدوى

٥- تاريخ المسرح فيتوباندولفى –ت/الاب الياس زحلاوى

٦- الادب اليونانى القديم –دعلى عبدالواحيد وافى

٧- الفرس والضارعات –اسخيلوس –ت/ابراهيم سكر

٨- الدراما الاغريقية –د.ابراهيم سكر

# بەشی سێیەم

# سەرەتایی ڕۆمان وەك نووسەری ژن

جین ئۆستن-Jane Austen

دایکی ڕۆمانی ئینگلیزی

ئەم ژنە نووسەرە لەکۆتایی سەدەی هەژدەو سەرەتای سەدەی نۆزدەدا ژیاوە، ئەم ماوەیە ماوەیەکی گرنگی گۆڕانکارییەکانە لەمێژووی ئینگلتەرەدا.

جین ئۆستن لەشانزدەی دیسەمبەری سالّی ١٧٧٥ لەدایکبووە لەهەژدەی یۆلیۆی ١٨١٧دا مردووە، حەوتەمینی ئەو هەشت منداڵەیە کەجۆرج ئۆستن هەیبووە، نووسینەکانی جین ئۆستن بەهەموو جیهاندا بلاّوکراوەتەوە هەر لەچینەوە تا ئەمریکاو ئەوروپاش، لەهەموو جێگایەك بەهۆی نووسینەکانیەوە خۆشەویستی خەلّکە، بەرهەمەکانی بۆ بیست و پێنج زمانی جیاواز وەرگێڕدراون، ملیۆنان ژن و پیاو بەبەرهەمەکانی ئاشنابوون لەڕێگەی خوێندنەوەو شانۆو سینەماوە، دواجاریش بەهۆی ئەو دەنگدانەوە گەورەیەی کە لەدوای پێشکەشکردنی فلیمی (کبریاو وهوی) لەسەر شاشەی

تەلـەفزیۆن بڕیاریـدا ئـەم دەزگایـە بەچـاپکردنەوەی هەرسـی کتـێبی (ئیمـا)و (اقنـاع)و (احساس و حساسیه) لەبەریتانیادا ساڵانە نیو ملیۆن چاپی ئـەم کتێبانـەی جـین ئۆسـتن دەفرۆشرێت.

لەساڵی ١٩٧٥دا لەمانگی دیسـەمبەردا لـەیادی تێپـەڕبوونی دووسـەد سـاڵ بەسـەر لەدایکبوونی ئەم نووسەرەدا کتێبخانەی بەریتانیا پێشانگایەکی کردەوە بـۆ مـاوەی دوانـزە هەفتە کەزۆربەی خەڵکی ئینلگیزو خەڵکانی تر بانگهێشت کرابوون لەوێدا نووسـینەکانی و شێوازی ڕێورەسمی وتارنووسینی ئەو ساڵانەی لە تاریکیدا ژیـاوە خرانـەڕوو پـێش ئـەوەی دەرگای پێشانگاکە دابخرێت تەلەفزیۆنی بەریتانیا زنجیرە تەلەفزیۆنیەکی بـەناوی عـالەم جـین ئوستن-ەوە پێشکەشکرد.

# ژیاننامەی جین ئوستن و کەسێتی نێو ڕۆمانەکانی

جین ئۆستن وەکو زۆربەی خەڵکی سەردەمەکەی زیاتر سەرقاڵی کشتوکاڵ و خوێندن بووە، خێزانەکەی چالاك بوون و بەبەردەوامی سەرقاڵی خوێندنەوەی ڕۆمان و شیکردنەوەو بەدواداچوون و بەڵگەو وشەسازی بوون، ئەوکات تەمەنی نەگەیشتبووە پانزە ساڵ لەنێوان ساڵانی ١٧٩٥-١٧٩٨ سێ ڕۆمانی نووسی لەگەڵ بەشێك لەو هەڵەو کەموکورتیانەی کەتێیدا بوو ناوبانگی پێ دەرکرد، بەڵام ساڵانی دوای ١٧٩٨ ساڵانی پڕ لەئارامی و قەناعەت و بڕوابەخۆبوون بوو بۆ جین ئۆستن (٢-٣).

جین ئۆستن خاوەنی نووسینی نۆ ڕۆمان و چەندین کۆپلە شیعرە، لەدوای ساڵی ١٧٩٨ەوە ڕۆمانی (منتزە مانسفیلد)و (ئیما)و (دیر نورسانجر)ی نووسیوە.

لەساڵی ١٨٠١دا دەگوێزنەوە بۆ شاری (باث) لەگەڵ خێزانەکەیدا بەڵام ئەم شارەی پێخۆش نەبووە هەر بۆیە دوای مردنی باوکی لەساڵی ١٨٠٥دا جین و دایکی و خوشکەکەی دەچن بۆ (شوتون جیث) براکەی دەوڵەمەندە خانوویەکیان دەداتێ و چاودێریان دەکات(١) ئێستا ماڵەکەی کراوەتە مۆزەخانە(٤).

هەرچەندە جین ئۆستن خۆی لەخێزانی چینێکی مام ناوەند بووە توانیویەتی کێشەو مەینەتی ژنانی سەردەمەکەی لەو کۆمەڵگایەدا بخاتەڕوو، هەروەها لەگەڵ ئەوەی لەژیانیدا شوی نەکردووە ئەمە ڕێگرنەبووە لەوەی کەکسایەتی و بابەتی ڕۆمانەکانی باس لەهاوسەرێتی ئەو ژنانە بکات کە دەیانەوێت شوبکەن بۆئەوەی پلەی کۆمەڵایەتیان لەکۆمەڵگای ئەو سەردەمەدا بەرزبکەنەوە، لەکۆتایی هەموو ڕۆمانەکانیدا هەموو کسایەتیە ژنەکان دەبنە دۆست و خۆشەویستی پیاوێکی گونجاو.

دیاری جین بۆ جیهانی خۆرئاوای ئەمڕۆ ڕۆمانەکانیەتی کەباس لەژیانی ڕۆژانەو کێشەکانی ڕۆژانەی چینی مامناوەند دەکات، ڕۆمانەکانی لەڕیزی پێشەوەی ئەوکتێبانەن کەژیانی ئافرەتان شرۆڤە دەکات لەسەرەتای سەدەی نۆزدەدا(٤).

جـین ئۆسـتن لـە٢٤/٥/١٨١٧ تەندروسـتی روو لـەخراپبوون دەكـات لەلایـەن كاساندرای خوشكیەوە بۆ چارسـەركردن دەبرێـت بـۆ شـاری (وینشسـتر) بۆئـەوەی لـەژێر چـاودێری دكتـۆری خێزانەكەیانـدا بێـت، بـەڵام نەخۆشـییەكەی نادۆزرێتـەوە، هـەر بۆیـە لەباوەشی خوشكەكەیدا دەمرێت لە(كاتدرائیە وینشستر) دەنێژرێت(٢) ساڵانە بەهەزاران كەس دەچنە سەر گۆڕەكەی ئەو پارچە مەرمەڕە نووسراوە دەخوێننەوە كەرۆژی لـەدایكبوون و رۆژی مردنەكەی لەسەرە لەگەڵ ئەو وشە جوان و بەنرخانەی بۆ ئەو دڵە ئاڵتونیە نووسـراوە (دڵە خێرخوازەكەی رەفتارە دڵفڕێنەكـەی، توانـا بـەهێزەكانی بـیری، جێگـای رێزبـوون بـۆ هەموو ئەو كەسـانەی دەیانناسـی و نزیكترین خۆشەویسـتیان بـوو بـۆ پەیوەندیـە گـەرم و گورەكـانی، خەمـەكانیان لەگـەڵ دڵسـۆزیەكەیدا هاوتایـە، ئـەوان دەزان ئـەم زیانـە قەرەبووناكرێتـەوە، بـەڵام لـەقوڵایی ئـەو خەمانـەدا هیواداربـوون كـە خێرخوازییەكـەی فیداكارییەكەی، پاكی و ئیمانداریيەكـەی، دەبنـە یارمەتیـدەری بـۆ وەرگـرتنی رۆحـی لای مەسیح ١-٥ ) .

سومەرت مۆم لەبارەی جین ئۆستن-ەوە دەڵێت: ژنم وەك خـۆی بینیـەوە كاتێـك جـین ئۆستن لەدایكبوو، هەروەها مالای مێژوونووسی گـەورە دەڵێـت: جـین ئۆسـتن گـەورەترین نووسەری ئینگلتەرایـە، لـەدوای جـین پێـوەرو سەرچـاوەیەكە هـەر كاتێـك بمانـەوێت كـاری نووسەرە نوێیەكان هەڵسەنگێنین دەگەڕێینەوە بۆ لایان (١-٤).

لەروانگەی مێژووەوە ئەو سەردەمە بـەوە جیادەكرێتـەوە كەرەشـەبای شۆڕشـی فەرەنسـا بەرەو وڵاتەكەی ئەمیش هەڵدەكات، لەدوای ئەوەوە بەریتانیا دەكەوێتە نێـو شـەڕی گـەورەی ناپلیۆنەوە بەهۆی گەمارۆدانەوە زۆربەی كەنارەكانی ئەو وڵاتە تووشی كارەسـاتی كوشـتن و بڕین دەبن، لەگەڵ بڵاوتی شۆڕشی پیشەسـازیدا هەموو بنەما كۆمەڵایەتی و ئابوورییـەكان بۆ ریتمێكی تر گۆڕان لەگەڵ پێشبینیەكان بەوەی كەهێزێكی تازە بـۆ گەشـەكردنی وڵات جێگەی هێزە ئابووری و كۆمەڵایەتیەكان لە نەخشەی وڵاتدا دەگرێتەوە.

لەرووی مێژووی ئەدەبیاتەوە نووسینەکانی جین ئۆستن سەر بەقوتابخانەی کلاسیکیەکانە، رۆمانەکانی بەشێکن لەو بەسەرهات و رووداوانەی کە زاڵ دەبن بەسەر مێژووی ئەو وڵاتەدا لەقات و قڕی کەهەموو لایەکی وڵاتی گرتبووەوە ژیان بەقازانجی بنەماڵەی پاشاکان و دەرەبەگەکان شکابووەوە، زۆربەی کەسایەتی ناو رۆمانەکانی لەنێو بنەماڵەی پاشاکانن یان لەدەوڵەمەندە گوندنشینەکان ئەوی کە هەبووە لەخۆشگوزەرانی و ئارامی گوندەکانی ئینگلتەرا وێنەی کێشاوە(٣).

لەبەرئەوەی جین ئۆستن لەقوتابخانەی کلاسیزمە بەراوردکردنی بەنووسەرانی رۆمانتیك جیاوازییەکی سەرتاسەر لەخۆدەگرێت، هەروەکو بەراوردکردنی بەجۆرج ئیلیوت و والتر سکوت و ئەمیلی برۆنتی، چەندەها فۆرمی جیاوازو ناوەرۆکی جیاواز هەڵدەگرن (٦)، هەرچەندە جین ئۆستن لەرۆمانی (دیرنورساجر) بەئاراستەیەکی رۆمانسیانە دەنووسێت، بەڵام ناوەرۆکەکەی تایبەت دەکاتەوە بەئازارو ترسەکان و قەڵای رووخاو دارستانە چڕەکان و هێزە نادیارەکەی سروشت لەهەمانکاتدا پابەندە بەوێناکردنی ژیانی ناوماڵ و پشێوی و ئاڵۆزبەکان و کێشەکانی مرۆڤی ئاسایی.

## جین ئۆستن لەروانگەی رەخنەگرانەوە

زۆربەی رەخنەگران لەگەڵ ئەوەدا تەبان کە جین ئۆستن تا دوورترین ئاست لەکێشەکانی کۆمەڵی نەڕوانیوە، بەڵکو وابەستە بووە بەچەند حاڵەتێکەوە، راستە رۆمانەکانی لەسەر بنچینەی رووداوەکان بنیاتناوە، کەسایەتیەکانی لەو بەشەی کۆمەڵ پێکهاتوون کەپاشاو خاوەن چانسەکانن هەروەها پیاوانی ئاینی و ئەفسەرو بازرگان و پارێزەران و دایەنەکان کەسایەتی دوای ناوەندی رۆمانەکانن، لەگەڵ ئەوەی لەرووی هونەرییەوە لەشتێك کەموکوڕی نییە، لەهەمان کاتدا راستگۆیی و دەستپاکی و پابەندبوونی بەوێنەی ئەزموونە مرۆڤایەتیەکان شتێك نیە بەئاسانی هەستی پێبکرێت، زۆربەی رەخنەگران پێیان وایە مێژووی ئەدەبی ئینگلیزی سوودمەندتر دەبوو ئەگەر جین ئۆستن زیاتر رۆمانەکانی لەبارەی رووداوەکانی شۆرشی فەرەنساو شەرەکانی ناپلیۆن و بەرپاکردنی شۆرشی پیشەسازیەوە بنووسیایە، رۆمانەکانی پەیوەندیەکی راستەوخۆیان بەرووداوەکانەوە نییە، کەواتە دەکرێت بڵێین جین ئۆستن رۆمانەکانی زیاتر پانۆرامای ژیانی کۆمەڵگای ئینگلیزیە، واقعیش ئەمە زیاتر دەسەلێنێت لەم بارەیەوە لێهاتووە هەر لەوێناکردنی ئەو کۆمەڵە کەسانەی کەتۆماری کردوون بچووکترین دوودڵی نییە بۆئەوەی کەدڵی پاڵەوانەکان بۆ بزواندنی ژیان دەخاتە لێدان (٣).

جین ئۆستن لەو رۆماننووسە گەورانەیە کە کاری لەسەر چۆنیەتی سروشتی مرۆڤەکان کردووە بەسەنگێکی فراوانەوە ناسۆ لەبەردەم مرۆڤەکاندا والآ دەکات و دادگایەکی گشتگیری هەیە، لەگەڵ ئەوەی تێڕوانینی دیاریکراوە، بەڵام تا ئەوپەڕی سنوور دەوڵەمەندو تۆکمەیە لەزماندا.

جین ئۆستن نیشانەیەکی دیارە لەمێژووی رۆمانی ئینگلیزیدا لەبەرئەوەی لەکۆتایی سەدەی هەژدەدا هونەری رۆمانی لەشێوازی قوتیانە رزگارکرد ئەوەی کەهەمیشە بەرۆمانی ترس ناسرابوو کە باوبوو لەنێوەی دووەمی ئەو سەدەیەدا لەنێو رۆماننوسانی ئینگلیز، ئەو

جۆرە نووسینە بۆ نووسینەکانیان پشتیان بەو چیرۆك و ئەفسانەو رووداوانە دەبەست کە لەسەدەکانی ناوەراستدا باو بووە ئیلهامیان لەوانەوە وەردەگرت و کوێرانە دەکەوتنە هەڵبەستنی چیرۆکەکانیان، لەهەموو کۆت و بەندێك ئازادبوون لەشوێنە نادیارەکاندا چیرۆکەکانیان هەڵدەبەست و گرێچنی رۆمانەکانیان بەخێوو ئەو تارماییانە دەستی پێدەکرد کە لەنێو دارستان و دۆڵ و گردو جەنگەڵەکاندا هەورەکان دەنگ دەداتەوەو وڵام دەدەنەوە لەنێوەشەودا، پاڵەوانەکانیش لەوێوە دەردەکەوتن، لە نووسەرانی ئەم جۆرە نووسینە (هۆراس والپۆل ۱۷۱۷-۱۷۹۷)و (ئان رادکلیف ۱۷٦٤-۱۸۲۲) لە نموونەی رۆمانەکانیشیان (قەڵای ئۆترانتو)و (نهێنییەکانی ئۆدلفۆ)یە کە بەناوبانگترین رۆمانی ئەو دوو نووسەرەن.

هەرچەندە مەبەست لەنووسینی ئەم جۆرە نووسینانە خستنەرووی راستییەکان و رەوینەوەی .. س و دڵەراوکێ بوو لەبەرامبەر گەرانەوەی شادی و گەشانەوە هەڵوێست نواندن لەهەست و سۆزدا، بەلام جین ئۆستن بەرێگەییەکی رێکوپێکتر لەو شەپۆلانەی نووسین دەنووسێت ئەو بەسروشتی خۆی نارەزووی لەزیادەرۆی نییە لەهەست و سۆزەکاندا پشت بەهێزێکی ون و هەستێکی ئەندێشەمەند دەبەستێت گرنگی بەیاسای شێوەی هونەری و رێورەسمێك دەدات لەنووسینەکانیدا کەخۆبەستنەوە پابەندبوونی تێدا نییە لەسەپاندنی سیفەتەکان بەسەر کەسایەتیەکاندا، خۆیان بەشێوەیەکی لۆژیکی بەرەوپێشەوە دەچن هەروەها رووداوەکانیش لەناوەوە گەشە دەکەن و هیچ بەشێك تێکەڵ بەبەشەکەی تر ناکات، بەم شێوەیە رێورەسمی جین ئۆستن بەرووبەکی تردا جیاوازە لەو شێوازەی کە رۆمانی ئینگلیزی پێ دەنووسرا لەسەر دەستی هۆراس والپۆل و ئان رادکلیف و هاوشێوەکانیان، ئەو شێوە نووسینەی کەدرێژەی هەبوو تاگەیشتن بەتەوژمی رەسەن و هەلکەوتنی پایەبلندانی هونەری رۆمان لەئینگلتەرا، ئەوانیش ساموئیل ریچاردسۆن ۱٦۸۹-۱۷٦۱ و هێنری فیلیدنگ ۱۷۰۷-۱۷٥٤و دانیال دیفۆ ۱٦٦۰-۱۷۳۱ کە خاوەنی هەرسێ رۆمانی بەناوبانگی پامێلاو رۆبنسۆن کرۆزو ئەمیلیاو چەندین رۆمانی ترن بەتایبەتی

فیلدینگ بێجگە لەرۆمانی ئەمیلیا خاوەنی ئەم بەرهەمانەشە جۆزیف ئەندرۆزو شامێلاو تۆم جۆنس، ئەم سێ نووسەرە بەلووتکەی سەرهەڵدانی رۆمانی ئینگلیزی دادەنرێت، چونکە نووسینەوەیەکی سروشتیانەی کەلتوری رۆمانی ئینگلیزی بوون (٣-٧)

جین ئۆستن پەیڕەوی شێوازی جەوهەری بابەتی کۆمەڵایەتی ریچاردسۆنی کرد بەوەی کە ریچارد سۆن بۆ وێناکردنی ژیانی خێزانی لەکێشەکانی هاوسەرێتی و پەیوەندی باوکان و دایکان بەمنداڵەکانیانەوە دەکۆڵێتەوەو لەکۆن و نوێدا ساتەکانی شەرمەزاری کەوا لەمرۆڤ دەکات بڕیارێك بدات و پاشەرۆژی لەسەر وەستاوە.

هەروەها جین ئۆستن بەشێوازی درامیانەی فیلیدینگ سەرسام بوو جا لەوێناکردنی کەسایەتیەکاندا یا لەگفتوگۆو دیمەنەکاندا یەك لەدوای یەك رێکی دەخست بەدوای یەکدا.

واتە رۆمانەکانی جین ئۆستن بەردەوامی بوو بۆ ئاراستە واقیعیەکان کەیەکێك بوو لەو خاڵانەی کە رۆمانی ئینگلیزی پێی جیادەکرایەوە لەسەرەتای سەرهەڵدانیدا، رووداوی رۆمانەکانی هەمووی پشتیان بەستووە بەبنچینەیەکی تۆکمە لەواقیعی زیندوو لەباکگراوندی کۆمەڵایەتی و ژینگەیی، کەسایەتی نێو رۆمانەکانی وا هەست دەکەیت بەتەواوی لەخوێن و گۆشتن، هەست دەکەن و بیردەکەنەوە بەرێگەیەکی لۆژیکیانە هەڵسوکەوت دەکەن لەژێر سێبەری ژیاندا دەبنە ئاوزخە لەنێو سەدەکەی خۆیان وەهەموو سەدەکانی تریشدا (٣).

سەردەمی ژیانی جین ئۆستن سەردەمی گۆڕانکاری کتوپڕی ئاینزای کلاسیکی بوو لەئینگلتەرا هەرچەندە نووسەرانی ئەم نەتەوەیە زیاتر لەسەر کەلتوری رابردوویان دەژیان وەك لەنووسەرانی ئەوروپا بەگشتی و نووسەرانی فەرەنسا بەتایبەتی، کاتێ گرای Gray رەخنەگرو نووسەر کە لەناوەراستی سەدەی هەژدەدا ژیا وەکو سەرەتای تەوژمێکی رۆمانتیکی سەربەهەڵدا دواتریش کە کۆلیردج Colcridge کە ساڵی دوای مردنی گرانی لەدایکبووە وەك تەوژمێکی بەهێزو تازەگەری رۆمانتیکی هەنگاوی نا، ئەگەر لەماوەی سەرهەڵدانی ئەم تەوژمە لەئینگلتەرا بکۆڵینەوە جموجۆڵی رەخنەیی

رۆمانتیکیانە کەمتر گەشەی کردووە بەبەراورد لەگەڵ سەرهەڵدانی تەوژمی بابەتی دەقی رۆمانتیکیانە، ئەگەر باس لەگەورەترین رەخنەگری ئەو سەردەمەش بکەین کە جونسون-ە هەر لەریزی کلاسیکیەکاندا بووە.

ماکولی Macanlay کە لەنێوان سالآنی ١٨٠٠-١٨٥٩ دا ژیاوە بەرەخنەگرێکی گەورەی ئینگلیزی دوای سەردەمی کۆلردج وئارنۆلد دادەنرێت، وتارنووسێکی سیاسی بەناوبانگ بووە لەگۆڤاری ئەدنبەرەدا گەورەترین کاری ئەدەبی ماکولی ئەو کتێبەیەتی (مێژووی ئینگلتەرا لەماوەی حوکمڕانی جیمس دووەمدا) (٨).

ئەگەرچی ماوەی ژیانی ماکولی ماوەی سەرهەڵدانی تەوژمی رۆمانتیکیانەیە، بەڵام شەیدای نووسینەکانی جین ئۆستن بووە وەك رەخنەگرێك لێکۆڵینەوەی لەسەر نووسینەکانی کردووە.

زۆربەی رەخنەگران پێیان وایە جین ئۆستن مامۆستایەکی لێهاتووە لەخولقاندنی فەزای پێکەنیندا، لەو کەسانەیە کە هەڵوێستەکانی خوێنەر بەتەنها تووشی پێکەنینی گاڵتەجاریانە ناکات بەلکو زەردەخەنەیەکی ئارام دەخاتە سەر لێوی خوێنەر، پێیان وایە سەرچاوەی ئەم جۆرە نووسینەی جین ئۆستن دەگەڕێتەوە بۆ ئەو دابونەریتەی کە لەکۆمەڵێك لایەنەوە سەرچاوەیان گرتووە لایەنێکیان حوکمە گشتگیرو هەمەلایەنەکەیە کەسەرەتان بۆ دەرخستنی راستیەکان کەزۆر سەرسامانە پیشانی خوێنەری دەدات ئەم رووە دەمامکاویە تاتەواوبوون لەخوێندنەوەی دەستەواژەکە دەرناکەوێت، رووە راستەقینەکەی بەشێوەیەکی جدی راستیەکان دەردەخات بەڵام رووە پێکەنیناویەکەی لەقولآیدا بانگەشە دەکات، ئەم دەستەواژە کراوەیە بەلگەیەکن بۆ توانای جین ئۆستن کەباوەڕی بەو شێوازو تیژە بووە.

لەلایەکی ترەوە ئەو بەشە پێکەنیناویەی تری نووسەر لەوێناکردندا پەنای بۆ دەبات ئەوەیە کە هەندێ لەکەسایەتی رۆمانەکانی لەدەربڕینی هەستەکانیان و لەجەختکردنەوەی ئارەزووەکانیان زیادەڕۆیی تێدایە، بۆ چوونە پێشەوەی رووداوەکان وا لەکارئەکتەرەکان

دەکات لەرۆحی پیاهەڵدان و هاوارکردندا کارامە بن، بەچەند نموونەیەکیش ئەم دەستەواژانە دەرازێنێتەوە.

هەندێ لەرەخنەگران ئەوە بەسەر جین ئۆستن-دا دەسەپێنن کەنووسەر لەکەسایەتیەکانیدا گاڵتەجاڕی دەخولقێنێت بۆ بەدەستهێنانی ئامانجێك هەندێك جار پاڵیان پێوەدەنێت بەرەو گێلی و رق لێبوونەوە، ئەگەر مەبەستیشی بێت بەهەمان چەشن پێچەوانەیان دەکاتەوە، لەم کەسایەتیانەدا لێکچوونی گەورەی کاریکاتێرانە هەیە لە روانگەی ئەوەی پشت بەهەموو ئەو شتانە دەبەستێت کە لەژیاندا هەیە لەهەڵوێست و ئاماژەی سەیر کە چاوی رەخنەگرێکی هونەرمەند رادەکێشێت، گەورەو باڵاتر پیشانی دەدات، گومانی تێدانییە رەخنەگری راستەقینە هەموو لایەن و پەنهان و ئەندێشەکانی مرۆڤ هەست پێدەکات و هەموو بەدخوییەکانی مەردومیەت کەکاردانەوەیان هەیە بەسەر هەڵسوکەوتی خەلکەوە دەبینێت.

جین ئۆستن لەروانگەی بۆچوونەکانی بەرامبەر بەریفۆرمی کۆمەلگا گاڵتە بەو بەدخودیە کۆمەڵایەتیە دەکات کەسوکایەتیپێکردن تێیدا بۆتە یەکێك لەسیفەتەکانی خەلك، بەتوانستی خۆی باس لەسروشت و قوڵایی مرۆڤ دەکات و ئاسۆی مرۆڤایەتی پیشانی هەموان دەدات، لەگەڵ ئەوەشدا بەزەوقە هونەرییەکەی توانیویەتی بۆچوونێکی ئیجابیانە لەروانگەی خەلکی مرۆڤدۆستەوە بەدەست بهێنێت.

زۆرن ئەوانەی چێژ لەنووسینەکانی جین ئۆستن وەردەگرن، لەگەڵ ئەوەی بەسەرهاتی بابەتی رۆمانەکانی ژیانی نەوەکانی رابردوون، بەڵام خوێنەرێکی نایناش ئەوە وەردەگرێت و دەبینێت کەنووسینەکانی لەمرۆدا زۆر گەورەترو گەشاوەترن وەك ئەوەی کە لەرابردوودا هەبووە.

زۆربەی نووسەرو رەخنەگران پێیان وایە جین ئۆستن بەوە جیادەکرێتەوە رۆحێکی تێکۆشانی بەهێزە، ژیانێکی بۆرجوازیانەی ئارام ژیاوە، بەبێ ئەوەی خۆشەویستی بکات هەموو تەمەنی بەئەرکە دینیەکان و نووسین بەسەربردووە، بول دوتان لەکتێبی (الادب

الانگليزى)دا دەڵێت: (جين زانا بووە، كەسانێك لەرێزى ئەودا نەبوون بەتەنها ئەوانە نەبێت كەتوانيويانە، درك بەشوێنى پايەبڵندى گوندنشينانەى ئەو بكەن، لەبارەى خۆشەويستى و كێشە نابڕومەندەكانەوە نەدواوە، هەستاوە بەباسكردنى ئەركى هاوسەريتى و دەيەوێت بەلاوازى و بێ هێزى و منداڵانەيى و سەرشێتيەكانيان بمانهێنێتە پێكەنين.) (٩).

هەرچۆنێك بێت نەوەكانى ئەمڕۆ كە جين ئۆستن دەخوێننەوە هەست بەسەرسوڕمان و نوێگەرايى دەكەن ماكولى عاشقى نووسينەكانى جين ئۆستن دايدەنێت لەرێزى ئەوانەى لەهەر نووسەرێكى تر شێوازى نووسينى نزيكە لەشێوازى مامۆستاى گەورە شكسپيرەوە لەتنسيۆن و سينسبرى بەدايكى رۆمانى ئينگليزى دادەنێت (١-٢-٤)

## کارەکانی نووسینی جین ئۆستن

جین ئۆستن خاونی نۆ رۆمان و چەندین بەیتی شیعریە، شیعرەکانی لەدواساتەکانی تەمەنیدا نووسیوەو وادەردەکەوێت کەهەرگیز رۆژێك لەرۆژان هەستی بەئاسوودەیی نەکردووە.

لەبەهاری تەمەنیدا بوو یەکەم رۆمانی بەناوی (الحب والصداقه)ەوە نووسی تەنها تەمەنی لەپانزە سالّ تێپەڕی نەکردبوو دوای ئەوە شەش رۆمانی تری نووسی، بەلاّم چانسی بلاّوکردنەوەیان نەبوو هەتا نۆ سالّی خایاند دواتر خەلّکێکی زۆری وەك خوێنەر لەخۆی کۆکردەوە.

هێشتا لەتەمەنی گەنجێتیدا بوو کەهەردوو رۆمانی (کبریا وهوی)و (عقل و عاطفة)ی نووسی گێلێتی و مرۆڤایەتی بابەتی سەرەکین لەم دوو رۆمانەدا، هەروەها لەوێنەکێشانی کچاندا لەم دوو رۆمانەو سەرجەم بەرهەمەکانی تریشدا لێهاتوو بووە، بەلاّم ...ەوی کەم ئەزموونیەوە شتێکی ئەوتۆی لەسەر رۆحیەتی پیاو هەست پێنەکردووە. (۲)

(کبریاو وهوی) ئەو رۆمانەیە کە لەسالّی ۱۸۱۳دا نووسیویەتی واتە لەدوایین قۆناغەکانی ژیانی جین ئوستندا، هەرچەندە مێژووی نووسینیی دەگەرێتەوە بۆ ماوەی نێوان ئۆکتۆبەری ۱۷۹۶و ئۆگستی ۱۷۹۷ ئەوکات ئەم رۆمانە بەناونیشانی (انطباعات اولیة) ...ەو...دوای ئەوەی لەلایەن هیچ دەزگایەکەوە بلاّونەکرایەوە، کاریگەری ئەمە وایلێکرد رۆمانی (عقل وعاطفة) بنووسێت لەسالّی ۱۸۱۱دا پێشوازییەکی باشی لەلایەن خوێنەران و بلاّوکراوەکانەوە لێکرا، بەلاّم هێشتا سۆزێکی بۆ رۆمانە رەفزکراوەکەی هەبوو هەر بۆیە کەوتە چاککردن و گۆڕینی هەندێك دەستەواژەو گفتوگۆی نێوان کارەکتەرەکانی نێو رۆمانەکە جارێکی تر لەژێر ناونیشانی (کبریاو وهوی) قبولکراو روونـاکی بەخۆوەدی لە یەنایەری (۱۸۱۳)دا بەچاپگەیشت، جین ئۆستن لەم رۆمانەدا گەیشتە دوا پلەی

گەورەیی خۆی لەپێشکەوتن و هونەری ڕۆمان نووسین هەروەها ڕوئیا هونەرییەکانی زیاتر کامڵ و پێگەیشتبوون.

(کبریاو وهوی) زیاتر لەهەر ڕۆمانێکی تری جین ئۆستن لەهەست و دیدی خوێنەردا مایەوە، لەلای زۆربەی خەڵك ڕۆمانی ئینگلیزی بەبێ باسکردنی جین ئۆستن هیچ شەوق کێشێکی نییە لەوتێناکردنی کەسایەتیە پێکهیناویە خەمگینەکانەوە دەتوانێت پلەو پایەیەکی بەرزی بۆ دابنرێت لەنێوان کەسایەتی و ڕۆماننووسانی ئینگلتەردا، لەزۆربەی ڕۆمانەکانیدا جین ئۆستن پابەندە بەبابەتی هاوسەرێتیەوە، ڕەنگە هەندێ جار بەناوەرۆکێکی جیاوازتر نووسیبێتی، بەڵام (کبیریاو وهوی) ناتوانین بەتەواوی لەو قاعیدەیە بیهێنینە دەرەوە، چونکە لەم ڕۆمانەشدا بەهەمان شێوە پەیوەندی زیندووی لایەنی کۆمەڵایەتی و ئابووری و پەروەردەیی و سۆزداری تێدایە. (٣)

لەم ڕوانگەیەوە دەبینین جین ئۆستن بەتەواوی دەربڕی سەردەمەکەی خۆیەتی بڕوای وایە کە هاوسەرێتی تاکە خواستێکە کەکچان دەبێت هەوڵی بۆ بدەن ڕێگەیەکە بۆئەوەی پشتگیری بکرێت و چاودێری بکرێت لەهەمان کاتیشدا ئەمە پشێویی دەخاتە دڵەوە بەتەنها مسۆگەرکردنی ئایندەی کچان مایەی قبوڵ کردن نییە، چونکە هۆیەکە بۆ مردنی سۆزەکانیان یا پاڵیان پێوەدەنێت بۆ پێکهێنانی پەیوەندی لەگەڵ پیاواندا بێ ئەوەی ڕێزو خۆشەویستی تێدابێت.

ڕۆمانی (کبریاو وهوی) هەمان ئەو واقیعە پیشان دەدات کە لەو کۆمەڵگایەی ئەو سەردەمەی ئینگلتەرادا هەبووە، لەباشترین کارەکانی جین ئۆستنە، باس لەگوندێکی بچووکی ئینگلیزی دەکات وەکو ئەو گوندانەی کەنووسەر خۆی تێیدا ژیاوە، بابەتی ڕۆمانەکەش شادی و خەمئامێزە، هیواو ترسەو سەرکەوتن و دۆڕاندنی خەڵکە لەژیانی ڕۆژانەدا وەکو هەموو ئەوانەی کەجین ئۆستن ناسیونی، خێزانی بەرێز بینت لەم ڕۆمانەدا هاوشێوەی ژیانی نووسەر خۆیەتی لەزۆر بابەت و لایەنیدا، هەروەها جین ئۆستن تا ئاستێکی گەورە لەکەسایەتی ئەلیزابیس بنیت دەچێت.

جین لەبارەی شەڕو رووداوە گەورەکانەوە شتی نەنووسیوە، لەگەڵ ئەوەی زۆرێـك لەشـەڕو شۆڕشـەکانی بینیـوەو ژیـانی کۆمەڵایـەتی سـەقامگیرنەبووە، کەسـایەتی رۆمانـەکانی بەشداریان نەکردووە لەخۆبەختکردن بۆ ژیان و مردنە ترسـناکەکان، جـین ئۆسـتن سـەرقاڵی جۆرێك بابەت بووە کەبریتی بووە لەو کێشانەی رووبەرووی هەموو کەسـێك دەبێتـەوە، ئـەو شتانەی هەموو کەسێك تووشـی دڵـەراوکێ دەکـات لـەژیانی تایبـەتی خـۆی ژیـانی ئـەو کەسانەی لێوەی نزیکن هەستێکی تایبـەتی هـەبووە لـەبارەی زانـینی چـۆنێتی سروشـتی مرۆڤەکان، رۆمانەکانی پڕن لەوێنەی خەڵکانێك کەخۆیان بەباشترین کـەس لـەوەی کەهـەن دەزانن. (١٠)

لەسـەر وتەی خانم لیفس ئەگەر باس لەجین ئۆسـتن بکـەین دەبێـت بـاس لەبلیمـەتی و داهێنانی ئـەو نووسـەرە بکەینـەوە لەبەرئـەوەی بەداگیرسـێنەری چـرای داهێنـانی چیرۆکی گێڕانەوە دادەنرێت بەهۆی ئەو رێگە ئەفسوناویەی دەیگرێتەبـەر لەنووسـیندا، نووسـەرێکی جدی و هۆشمەندە لەهونـەری خۆیـدا نقـوم دەبێـت، لەگـەڵ کێشـەکاندا بـەرەوڕوو دەبێتـەوە بابەتەکانی بەنەخشـی جـوان دەچـنێت و دەیگێڕێتـەوە، واتـە داینـەمۆی رۆمانـە بەتـەواوی لەشێوازی نامەکانـەوە بـۆ شـێوازی گێڕانـەوە هـەنگاوی نـاوە، خەزێنـەی بابەتـەکانی پـڕن لـەوردەکاری کـە ئەمـە گرنگییپێـدانی هونەرمەنـدێکی گەورەیـە بـەکارەکانی لەشـێوازو خستنەڕوودا هیچ شتێك لای ئەو کاڵ و کرچ نییە(٦)

(ایما) یەکێکی ترە لەچیرۆکەکانی جین ئۆستن، بابەتی ئەم رۆمانە باس لەهاوسـەرگیری دەکـات بەهاوسـەرێتی خـاتوو تیلـور دەسـت پێـدەکات و بەچـەند هاوسـەرگیرییەکی تـر رۆمانەکە درێژدەبێتـەوە تـا دواجـار بەهاوسـەرگیری دوو کـچ و دوو کـوڕی تـر لەرێگاکـەدا کۆتایی دێت.

(ایمـا) کتێبێکـی هەسـتیارە هـەموو بابەتـەکانی لەچوارچێوەی یەکەیـەکی پتـەوو زیندوودایە بۆیە لەپانتاییـەکی گـەورەو تایبەتمەنـدی خۆیـدا دەمێنێتـەوە، جـین ئۆسـتن لـەم رۆمانـەدا بـەبیروباوەڕەکانی و پەیوەنـدی کەسـایەتییەکانی ئەفسـوونی نووسـینی زیـاتر

دەردەکەوێت، بۆنموونە (فرانك چەرچڵ) بەراستی فێڵبازە یان ئەمە پەیامێکی گومانە؟ ئەمە بۆ ئەوەیە کە ئەو غەش کردنە پیشان بدات بەڵکو بۆ قوڵکردنەوەیە، کەسایەتیەکان لە(ایما)دا زیاتر ئاڵۆزن، هەروەکو خەڵکانێك لەژیاندا زۆر شت هەیە لەخۆیاندا بشێنەیی و لەپڕ کەشفی دەکەن (١).

جین ئۆستن لەمانگی جەنیوەری ١٨١٤ دا دەستی کرد بەنووسینی نۆڤلێتی (ایما) لەماوەی ساڵو نیوێکدا تەواویکرد کەمانگی مارسی ١٨١٥بوو.

ئۆستن تەمەنی ٣٩ ساڵ بوو کە (ایما)ی بەچاپ گەیاند لەکۆتایی ساڵی ١٨١٥دا نزیکەی ٢٠٠٠ دانەی لێ چاپکرا، لەم ژمارەیە تەنها٥٦٣ دانەی لێ مایەوە، نزیکەی ٤٠ پاوەندی پەیداکرد لەهەموو ئەو کتێبانەی کە هەموو تەمەنی خۆی تەرخانکرد بۆ نووسینیان، (ایما) چوارەمین نۆڤلێتی چاپکراوی جین ئۆستن بوو هەروەها دوارۆمانی بوو کە پێش مردنی نووسیبوی خەڵکێکی زۆر داواکاریان لەسەر ئەم کتێبە هەبوو هەربۆیە ناوبانگێکی گەورەی پێ پەیداکرد بەر لەمردنی(١١)، بێگومان (ایما) خوێنەر دەباتەوە بۆ نێو وردبوونەوە لە هەندێك لەهەڵەکانی ژیان خۆی هەرچەندە بڕواشمان بەوە نەبێت کە ژیان بەو شێوەیە هەستیار نییە کە لە(ایما)دا هەیە، بۆیە ناتوانین ئاماژەیەکی گشتی بەبابەتی ئەبستراکتیانەی (ایما) بدەین، لەبەرئەوەی هاوسەرگیری لە ژیانی واقیعدا شتێك نییە لەژن و پیاوی وەربگیرێتەوە لەهەمانکاتدا بەیەکداچوونێك هەیە لەنێوان رۆمانەکانی جین ئۆستن و ئەو بابەتانەدا کە ناتوانین لەیەکیان جیابکەینەوە، پێویستە زیاتر باس لەهەستیاریەکانی ئەو پێکداچوونە بکەین، چونکە ئەمە چیرۆکی ساحیرێك نییە کەچیرۆکەکە هەڵدەبەستێت.

خوێندنەوەی (ایما) ئەزموونێکی دڵخۆشکەرە چونکە چیرۆکێکی سەرپێیی نییە، بەڵکو دەمانباتەوە بەرەو فریشەبوون، بانگهێشتمان دەکات بۆ بەشداریکردن لەژیان بەهۆشیاریو هەستیارانەوە.

(ایما) بەتەنها گەیاندنی پەیامی چێژێکی جوانی بەخش نییە، بەڵکو گەیاندنی پەیامێکی ئەخلاقیە، لەبەرئەوەی جین ئۆستن کەمتر بایەخی بەو بۆچوونانە داوە کە لەلای

رۆماننووسانی تر هەیە، کەمتریش گرنگی دەدات بەو ژیانەی کەتەنها بـژیت، بەپێچـەوانەوە توانای ئەوەت پێدەبەخشێت کە بـەهێزەوە بروانیتـە ژیـان و لەگـەڵ خەڵکەکانـدا بـژیت کـە ئەمەش بەشێکی تری لایەنی ئەخلاقی مـرۆڤ دۆسـتانەیە نـاتوانین لەخـەمی ئەخلاقیانـەی جین ئۆستنی جیابکەینەوە. لەبەرئەوەی مرۆڤ داماڵراو نییە لەهەڵەو چەوتییەکان و هەمیشە لەلوتکەدا نامێنێتەوە، هەمیشە بەستراوە بەجۆرێك لە هەستی کاریگەرانەوە.

کـاتێ دەگەینـە گوزارشـتێکی راشـکاوانە لەسـەر دوا پرنسـیپەکانی ئەخلاقیـەت، هەروەکو ئەوەی بـەرێز نـایتلی لـەدوای رووداوەکـەی بـۆکس هیـل دەیکـات، یـان کاتێـك نامەکەی فرانك چرچڵ دەخوێنێتەوە روونکردنـەوەی تێدایـە، کـەهێزی دەربڕینەکـەی تـەنها پشت بەدروستی و راستی نووسینەکە نابەستێت، بەڵکو لایەنێکی سـۆزداری جـوانی ئـەو کەسانەشـی تێدایـە، بێگومـان رامـان دەکێشـێت بـۆ باوەڕهێنـان و حوکمـدان لەسـەر کەسایەتی بـەرێز نـایتلی، ئەمـە بەشـێکە لەنامەکـەی: (ئـەی ئیمـا، ئایـا هـەموو شـتێك خزمـەتت دەکـات بـەوەی بەڵگـەی زۆرت لەسـەر جـوانی و راسـتگۆیی و وەفـاداری هەریەکێکمان لەگەڵ ئەوی ترماندا لەکاتی هەڵسوکەوت کردندا دەسـت بکـەوێت؟)ئەمـە بەشێکە لەو هەسـت و سـۆزە ئەخلاقیـەی کـە لەرۆمانەکـدا هەیـە، کاتێـك دەیخوێنینـەوە لەسـاتێکی جـوانی گـەورەدا دەژی بـەوەی کـە هەسـتێکی قـوڵ پاڵپشـتیەتی و بەهـەموو باوەڕێکەوە نووسراوە.

جین ئۆستن چڕی و پڕی و وردەکاری و خۆدان لەکێشەی سۆزداری و کۆکردووەتەوە لـەو رۆمانەدا لەحوکمی بابەتیانە لانادات، دەکرێ بپرسین چۆن هـەموو ئـەم خەسـڵەتانە لەیـەك کاتـدا کۆدەکرێتـەوە؟ وەڵامـی ئـەم پرسـیارەش ئەوەیـە کـەجین ئۆسـتن شـێوازی نزیکـە لەسیمبولیزمەوە لە بابەتەکانیدا بۆ چوونەکانی بەزمانێکی ناسك دەردەبڕێت بۆچوونەکانی دروشم نین بیسەپێنێت بەسەر خوێنەردا، هەمیشە لەروانگەی بەپراکتیزەکردنەوە بۆ ئەوانـەی کە هەست دەکەن بەچوونەکانی دەردەبڕێـت و کـاری کـردووە، بـەروون و ئاشـکرا تێبینیـە کۆمەڵایەتیـەکانی لەگـەڵ وردەکاریەکانیـدا ئاوێتـە دەکـات بـۆ حوکمـدانی کۆمـەڵگا،

بەمانای نارازی بوون هەموو حوکمدانەکانی کۆمەڵایەتین بەختیاری مرۆڤایەتی تەنها پرانسیپ نین لای ئەو بەڵکو خاڵی گرنگیپێدانن ناتوانین ئەندێشە مەندێکی قوڵی بۆ بکەین تەنها لەگۆشەی جێگیری کۆمەڵگاوە نەبێت.

ئەمە خاڵی بەهێزی نووسینەکانی جین ئۆستنە ناتوانین نەیدرکێنین و دوودڵی بڕوانین، کێشەی وردەکارییەکانی لەشێوازیدا دەردەکەوێت هەر وشەیەکی لەشوێنی خۆیدا بەکارهێنراوە بەزۆر شوێنی بۆ نەکراوەتەوە، بەشێوەیەکی ناسك و جێگیر دانراوە بەبەراورد لەگەڵ ئەو وشانەی بەکاردەهێنرێت لەنێو کۆمەڵدا وتوێژیان پێکراوە لەو سەردەمەدا.

لەئاسۆیەکی تەسکەوە گرنگە جەخت لەسەر هەبوونی ئارامی بکەین لەکۆمەڵگای جین ئۆستندا، دەقی رۆمانەکە پێشەوایەتیمان دەکات بۆ ئەو بۆچوونە، چونکە (ایما) بەتەنها کاری سەردەمێك نییەو تێپەڕبووبێت نەشەو دانیشتێکی رەوشتیە (سەرات سلکویە) وەك زۆر جار ئەو ناوی لێدەنێت، ئێمە کە دەیخوێنینەوە تەنها وەك روونا کیەکی رابردوو نییە بەڵکو تیشکێکە لەسەر ئێستاش .

رەنگە بپرسین پەیوەندی (ایما) بەژیانی ئەمڕۆوە چیە؟ واتە بە چ مانایەکەوە مامەڵە لەگەڵ رۆمانێکدا بکەین کە ئەو لەواقیعێکی گەورەدا ئیشی کردووە لەگەڵ کۆمەڵگایەدا کە ئێستا مردون بۆ هەتا هەتایە کۆتاییان پێ هاتووە، ئەوەی لەئێستادا نرخی هەیە لەجیهانی ئەمرۆدا زۆر جیاوازە؟ بەراشکاوی ئەوەی لەم رۆمانەدا هەیە نرخێکی پڕ لەرەچەڵەك و چەسپاوە، لەبەرئەوەی سۆزو خەیاڵمان دەجولێنێ. ئەوەی لەسۆزو خەیاڵماندا بەهەڵبیی ماونەتەوە وایان لێدەکات کەم بینەوە.

ئەری وا هەست بکات ئەم رۆمانە وێنەیەکی مردووی کۆمەڵگای رابردووە ئەوە دەربڕینێکی بکوژە بۆ هونەرو ژیان، چونکە باشترین هەڵسەنگاندن و شرۆڤە کە لەم رۆمانەدا دەبینین ئەوەیە توانای دەربڕینی هەست و سۆزی ئەمڕۆی هەیە.

فەلسەفەی جین ئۆستن فەلسەفەیەکی کۆمەڵایەتییە، واتە دەتوانین وایدابنێین کەمچووکترین هێنانە لەرزینە بۆ هەموو پاڵپشتێکی لایەنی چاککاری و هێزێکی

ڕۆشنکەرەوەیە، دەبینین زیاتر بایەخ بەچارەنووسی ژنان دەدات لەکۆمەڵگادا، گرنگیەکە دەمانباتەوە بۆئەوەی جارێکی تر بەدابونەریتە بنچینەییەکاندا بچینەوە، لەڕووی بابەتیانەوە بانگەوازێکە بەڕووی کۆمەڵگادا ئەگەر بەشێك لەداکۆکیکردن لەئەرستۆکراتیەتی تێدابێت ئەوە لەسەر بنچینەی هزرمەندییەوە هاتووە نەك لەروانگەی بیروبۆچوونی فەلسەفیانەی ساختەوە گرنگی پێدرابێت، هەروەها بەرێگەی پروپاگەندە راستیە بنچینەییەکانمان پێشکەش ناکات (٦).

(سکوت: قلب مدلوثیان) رۆمانێکی تری جین ئۆستنە بێگومان جیاوازییەکی ئاشکرا هەیە لەنێوان رۆمانی ئیماو قلب مدلوپیاندا، جیاوازیەکانیش لێکدژیەکی تەقلیدین کە لەچەند شتێکدا جێی پرسیارن:

وەکو بەشەکانی ئەو کتێبە دەتوانین باسی ئەو بابەتانە بکەین کەنووسراون، ماوەی ژیانی کۆمەڵایەتی و چارەسەرکردنی کێشەکان لە(سکوت: قلب مدلوثیان) لەڕووی کۆمەڵایەتیەوە بۆ چەند چینێك دابەشبوون کە لەنێوان شاژن کارولاین خۆیدا چەند جیهانێکی تاوان هەیە، ئەم دابەشکردنە زۆر فراوانترە لەوەی کە لەو رۆمانێکی سەدەی هەژدەدا بیبینینەوە، تەنانەت رۆمانەکانی فیلدینگ گرنگ و پڕبایەخن چونکە زنجیرەیەك پەیوەندی لەخۆگرتووە کەزۆر ئاڵۆزن نەك بەشێوەیەك کەچڕبوونەوەکەی پێویست بێت وەك ئەوەی لەم رۆمانەی جین ئۆستندا هەیە، خەڵکانی بەسەرهاتی ئەم رۆمانە جۆراوجۆرن بەڵام هەموویان لەدەوری یەك ناوخۆی بازنەیەکدا دەخولێنەوە.

لەم کەلتور رۆشنبیری و گشتیەی جین ئوستندا نموونەیەکی بەرزو رێکوپێکی لێ هەڵدەقولێت لەهونەرەکەیدا، هەروەکو چاودێریکردنی جین فیرفاکس بۆ نووسینگەی فرۆشتن و کڕینی پەروەردەکەران (مربیات) هەروەها پشکنینی قەرەجەکان کاتێك ئابڕووی هاریت دەبەن، یان کاتێك دەچێتە نێو باسکردنی ژیانی خێزانی (مارتن)ەوە بەهەمان ئاست و شێواز باس لەژیانی خێزانی وردەواس دەکات، ئەم ئاستی نووسینە لەڕووی

کێشەی هونەری و تەکنیکیەوە جێن ئۆستانی تووشی رەخنەکردووە دابەشکردنی بابەتی نووسین لەم رۆمانەدا لەهەموو شتێك زیاتر ئەوە بەم رۆمانە دەبەخشێت کەسیفاتی پالەوانانەی (ملحمیە) هەیە، بەلام لەهەمان کاتیشدا دادپەروەرانە نییە گەر بلێین ئەمە رۆمانێکی مێژووییە لەبەرئەوەی گرنگی بەمێژوو نەداوە بەشێوەیەکی سەرەکی باسی لێوەنەکردووە، هەرچەندە هەندێك جار جەختی لێ دەکاتەوە هەستێکی بەرامبەر بەمێژوو هەیە لەبەرئەوەی پالپشتەو بارودۆخێك دروست دەکات و پێشەنگی تاکەکانیشیەتی بەرەو رێگایەکی دیاریکراو.

ئەم رۆمانە زیاتر جموجۆلی رۆمانتیکیەکانی پێوەدیارە هەرچەندە ئەو جموجۆلە ئەدەبیە دوور نەبووە لەواقیعیەکانەوە بەپێچەوانەوە ئامانجی نووسینی رۆمانتیکیەکان لەو سەردەمەی ئەوبوو بگەنە ئەوپەڕی واقیعیەت، نموونەش لەسەر ئەمە ناسینی ئەدەبی ئەرستۆکرانیەکانە.

هەرچەندە زۆربەی جار سەرنەکەوتوون بەهۆی ئەو بەکەم زانینەی ئەم جۆرە ئەدەبە لەلایەن نووسەرانی کلاسیکیەوە بەرزکردنەوەی هونەری دیموکراتیانە لەلایکی ترەوە (٦).

لەبەرئەوەی نووسەرانی رۆمانتیك لەسەرەتادا نەیانتوانیوە پابەندبن بەکەلتووری سەدەی هەژدەوە لەکارەکانیاندا بەرەوپێشەوەچن و توانای نووسین کەشف بکەن لێرەوەیە رێژەی نارەزوومەندان لەئەدەبی رۆمانتیك خۆی لەتاکێتی و نادیاریدا دەبینێتەوە.

رۆمانتیکیەتی ((سکوت: فلب مـدلوثیات)) لەوەدایە بەرپەرچی کەلتووری سەدەی هەژدا دەداتەوە بەرفراوانی بۆچوونەکانی ئەدەبێکە بۆ خەلك.

ئەم ئەزموونی ژیانەی نێو ئەم رۆمانە ئەزموونی گەلی سکۆتلەندایە لەسەدەی هەژدا ئەوەی ئەم کتێبە دەیبەخشێت هێزە ئەوەی کە هەستی پێدەکات لەئازارو کێشەکانی جووتیاری وەکو هەمو نووسەرانی رۆمانتیك نائومێدە لەخاوەنی سەرمایە نوێیەکان ئەو سەردەمە پێی وایە کە شۆرشی پیشەسازی پەیوەندی پێکەوەبەستنی کۆمەلایەتی کۆن

دەروخێنێت بەناوی یەکسانی کە دیموکراتیەتی تێدا نییە یان بەناوی جۆرێك لەسۆزەوە لەپەیوەندییەکانی مرۆڤایەتیدا، کەواتە سکوت بەرپەرچدانەوەیەکە لەسەر شۆرشی پیشەسازی هەندێك جاریش گوزارشت لەخۆی دەکات و دەچێت بەرەو جیهانی خەون و سەدەکانی ناوەراستی سەردەمی رۆمانسی.

لەلایەکی ترەوە لەبرگەیەکدا تیشك دەخاتە سەر شۆرشی قوتبییەکان دژ بەشۆرشی پیشەسازی، بەڵام چیرۆکەکە هەشتا ساڵ دەگەرێتەوە بۆ دواوە ۱۷۳٦ خستنەرووی رۆمانەکە لێرەدا واقیعیانەیەو رۆمانتیکی نییە لەگەڵ ئەوەی کۆمەڵێك رەگەزی رۆمانتیکی لەگەڵ خۆیدا هەڵگرتووە ئەمە یەکێکە لەهۆکارەکانی سەرکەوتنی رۆمانی سکوت، لەبەرئەوەی بەشێوەیەکی واقیعی گوزارشت لەرونیای رۆمانتیکیانە دەکات.

ئەم رۆمانە ئاماژە بەو پێکداچرژانە دەکات کەلەنێوان گوندو شاردا هەیە، ئەوەتا کاتێك ئیڤی دەروات بۆ ئەدنبرە بۆئەوەی لەوێ بژی کۆمەڵێك خەڵکی لابەلاو بێ رەوشت هێرش دەکەنە سەری، ئەو بەگژداچوونەوەیە ئەوە دەردەخات کە لەنێوان خەڵکی گوندە کۆنەکان کەپابەندن بەئەخلاقیاتی دینی ئەو سەردەمەوە جیاوازن لەگەڵ شارنشینە دەوڵەمەندە سەرکەوتووەکان و هەژارە پیاوکوژەکان و دادوەرە راکردووە نائومێدەکان و بازرگانە ئیش رۆیشتووەکان کەپاسەوانی شارن، ئەمە ئەو جیهانەیە کەئیڤی بێزار دەکات و دەیەوێت بیروخێنێت کە لەدواجاریشدا دەیگۆرێت بۆ خانمێکی گەورە.

(سکوت: قلب ملوثیات) سێ بەشە: بەشی یەکەم گرنگترینیان لەئەدنبرە بەشی دووەمیان لەئینگلتەرایەو بەشی سێیەمیان لەنێو دەربەگەکانی سکۆتلەندادایە، ئەو بەشەی کە لەئەدنبرەیە لەهەموو بەشەکانی تری درێژترو چاکترە، لەبەرئەوەی بابەتی راستەقینەن و خەڵکەکانیش راستەقینەن و رووبەرووبوونەوەکانیش راستەقینەن.

هەر لێرەوەیە باس لەو پەیوەندیە دەکات کە لەنێوان سکۆتلەنداو دەوڵەتی ئینگلیزدا هەیە، رۆمانەکە لەم پەیوەندییەدا قووڵ دەبێتەوەو شاری ئەدنبرە وەك نموونەیەکی زیندووی خۆرئاوا پیشان دەدات.

بەشێوەیەکی گشتی کەس لەو کاتەدا خاوەنی شارێکی بەریتانیا نەبووە، شاری لەندەن هەزاران لەرووی تێگەیشتنەوە هەروا سەرپێیی دەژین، شوێنێك بووە خەڵکی لێ ژیاوە، بەڵام تێگەیشتن و پەیوەست بوونیان نەبووە وەکو شوێن و کۆمەڵ یا بابلێین بەگژداچوون و هاوکاری کردن لەنێوان خەڵکدا پەیوەندی بەهۆشمەندیەکی تاکیەوە هەبووە، بەڵام شاری ئەدنبرە نارامیەکەی وایلێکردووە ببێتە شوێنی ژیان، تەنیا شاری ئەسکوتلەندیە کە یەکەیەکی هۆشیاری ئەسکۆتلەندی هەبێت و لەمێژوودا باسبکرێت و ئەوەتا هەر لەناونیشانی رۆمانەکەشدا (سکوت: قلب مدلوثیات)دا دەردەکەوێت کە لەوەوە سەرچاوەی گرتووە (ئارامی: دڵی سکۆتلەندا) (مدلوثیات) مەبەستی لەشاری ئەدنبرەیەئەم رۆمانە رۆمانێکی گەورەیە هەرچەندە لەدیدی رەخنەگرانەوە بەشی دووەمی رۆمانەکە بەلاواز دەبینین، بەهۆی ئەو درێژدادری و گفتوگۆ بێزارکەرەی کەهەیە لەلینکۆنشیر، گفتوگۆیەکە گومان لای خوێنەر دروست دەکات لەگەڵ ئەوەشدا بەشی یەکەمی رۆمانەکە توانیویەتی بەسەر ئەم لاوازییەدا زاڵ بێت.

راستە چەند تەمومژێك دەوری ئەم رۆمانەی داوە وەك تەمومژی ئەرستۆکراتی مرۆڤەکان، هەروەها نەتوانراوە ئەو تەمومژە بڕەوێنرێتەوە کە بەر یەناسۆی رونیا دەگرێت[٦].

لەگەڵ ئەوەی جین ئۆستن نووسەرێك نییە بەکەم بینرخێنین بەڵام بەهەموو هەستە جوانەکانیەوە نووسەرێکە شێوازێکی تایبەت بەخۆی هەیە لەنووسیندا.

# شاكارەكانی جین ئۆستن-

# بینەری بەردەوامی سینەما

ئەگەر نووسەری گەورە شكسپیر لەو نووسەرانە بێت كەزۆربەی نووسینەكانی كراون بەفیلمی سینەمایی بەتایبەتی چیرۆكە بەناوبانگەكانی وەك رۆمیۆو جولیت و ماكبێس و هاملێت و تاجر البندقیەو هتد، ئەوا جین ئوستن-یش خاوەنی رێژەیەكی نزیكە لەوەوە بۆئەوەی كەزۆرترین بینەر هەن كە حەز بەبینینی كاری سینەما دەكەن بەرێژەی زۆر سەرسامن بەرۆمانەكانی ئەو كاتێك دەكرێتە بەرهەمێكی سینەمایی بۆنموونە رۆمانی (عقل و عاطفة)و (ایما)و بەهەمیشەیی (كبریاو وهوی) زۆر بەناوبانگن و بینەر هەرگیز بێزارنابێت لەبینینی چەند جاریش دووبارەكرێتەوە

(كبریاو وهوی) چەند جارێك كراوە بەفیلمی سینەمایی و فیلمی تەلەفزیۆنی و زنجیرەی كورت و شانۆگەری ئیشكردن لەسەر بەرهەمەكانی جین ئۆستن لەسیەكانی سەدەی رابردوودا دەستیپێكرد تا ئەم سالانەی دواییش هەر بەردەوامە دواكاری فیلمیش كە بەرهەم هێنرا لەسالی ٢٠٠٥دا بوو كە جو وایت دەرهێنەری ئەم فیلمە بەریتانیە بوو وەكو یەكەم ئەزموونی سینەما لەنواندنی ژنە ئەكتەری بەریتانیا كیرا نایتلی و ئەكتەری گەورە دونالد ساوسرلاند بوو، كیرا رۆلی ئەلیزابیسی بینیوە كەبەباشترین ئەكتەری ئۆسكار دەرچوو هەروەها دۆنالد ساوسرلاند رۆلی باوكی ئەلیزابیسی بینیوە ئەم فیلمە بووە جێگەی سەرسورمانی خەلك رەخنەگرانیش، چوار جار هەلبژێردرا بۆ ئۆسكارو شەش جار هەلبژێردرا لەبافاتای بەریتانیاو فیستیڤالەكان و خەلاتە سینەماییەكان، ئەم رۆمانە باشترین فیلمی لێ بەرهەم هات كەهاوشانی فیلمی ئەمریكی the great ziegfeld كە لەسالی ١٩٤٠ لەلایەن روبیرت زولیونادەوە دەرهێنراوە لەسیەكانیشدا دوو خەلاتی ئۆسكاری لەدەرهێناندا بەدەستهێناوە، هەروەها ئەزموونێكی تر بۆ بەفیلمكردنی ئەو رۆمانە ئەزمونی دەرهێنەری هندی Durinderchadhaیە كە دەرهێنەری فیلمی (العبها

مثل بیکهام)و چیرۆکی ئەم ڕۆمانەی کردووەتە فیلم بەناونیشانی (عروس و تحیز) دەستنیشانی ئەو ڕووداوە بنچینەیانەی کردووە کە پاڵی پێوەناوە وەك هاوسەرێتی و کێشەکانی، ئەم فیلمە کاری لەسەر جومگە ئەساسیەکانی نێو ڕۆمانەکە کردووە، هەرچەندە بەشێك لەکەلتوری هەندی تێهەلکێش کراوە لەسەماو گۆڕانی هەندی و چەند کورتە دیمەنێکی کۆمیدی.

زۆر فیلمی تر هەن کەئیلهامیان لەجەوهەری ئەم ڕۆمانە وەرگرتووە، لەگەڵ چەند ڕووداو کەسایەتی کارنەکتەری تردا دارێژراوەتەوە لەم جۆرە فیلمەش فیلمی ڕۆمانسی و کۆمیدی بەناوبانگ (مذکرات بریخت جونز)ە کە(رینیه زیلوجر) ڕۆڵی تێدا بینیوە بۆ خەلاتی ئۆسکار وەك باشترین ئەکتەر هەڵبژێردراوە.

پرسیارەکە لێرەدا ئەوەیە ئەو نهێنیە چیە کە وای لەبەرهەمهێنەرانی فیلم کردووە بەم ڕۆمانەوە پابەندبن لەگەڵ سەرسام بوونی خەلك لەگەڵ دووبارە پیشاندانەوەشیدا! هەرچەندە بۆ ئەمەشیان جۆری فیلم و توانای دەرهێنەرەکە لەخستنەڕووی ڕۆمانەکەدا دەیگۆڕێت لەگەڵ ئەوەشدا ناتوانین جیاوازییەك ببینینەوە لەنێوان ئەو ڕۆمانەی کە جین ئۆستن پێش مردنی لە١٨١٧ نووسیویەتی و لەگەڵ ئێستادا بەوپەڕی ئەمانەتەوە وێنەی ئەو ژیانە دەکێشێت کەکۆمەڵگای بەریتانیا لەدابونەریت و پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکان ژیاون، لەڕۆمانەکەدا باس لەمانەوەی کچان دەکات کە لە ماڵەکانیاندا خەریکی کارە ڕۆتینییەکانی ناو ماڵن وەك چنین و کاری ناوماڵ یا فێربوونی مۆسیقاو هەندێ یەکترناسین بەئومێدی ئەوەی چاوەڕوانی هەلێك دەکات بۆ یەکتربینینی گەنجان و بۆ بەدەستهێنانی فرسەتی هاوسەرێتی لەڕێگەی ئاهەنگە گەورەکان و سەماکردن کەباشترین کاتی گونجاوە بۆ گۆڕینەوەی هەست و سۆزی خۆشەویستی ئەم ڕۆمانە دەنگدانەوەیەکە بۆ ژیانی خێزانی کەشتێکە لەڕووداوە کەسێتیەکان هەروەك مێژوونووسانی ئەدەبی ئینگلیزی دەیگێڕنەوە کە ئەم تاکە نووسەرە بەم لایەنە سەرسام بێت، لەوەش گرنگتر لەم ڕۆمانەدا کە

هەیە ئەو مەزاجە جوان و رۆمانسییە کە خۆشەویستی لیزی و دارسی بەیەکەوە بەستۆتەوە، هەروەها ئەو تواندنە کۆمیدیانەی ژیانی خێزانی ببینێت، کاتێك دایکیان بەجۆرەها رێگە هەوڵدەدات کچەکانی بدات بەمێرد ئایندەی مادییان مسۆگەربکات.

ئەو خاڵە تەوەرییەی کە لەزۆربەی رۆمانەکانی جین ئۆستندا هەیە پەیوەندی بەهەڵەی سەرنجە یەکەمینەکانیەوە هەیە کە لەلای خەڵك ماوەتەوە، ئەمەش وا لەبینەر دەکات لەچاوەڕوانی دەرکەوتنی راستییەکاندا بێت، یەکێکی تر لەلایەنی سەرکەوتنی ئەم رۆمانە کەکراوەتە فیلم لەرابردوودا ئەو رۆمانسیەتە هێمن و ئەو پەیوەندییە ناجێگیرییەیە کە لەنێوان کەسەکانیدا هەیە دواجار بەسەرکەوتنی خۆشەویستی کۆتایی دێت لەسەر بنچینەی رووکەش و فەنتازییانە.

جین ئۆستن وەسفێکی وردی بۆ هاورەگەزەکانی خۆی کردووە ئەمە وامان لێدەکات کەبلێین جین ئۆستن بەراستی هەوڵیداوەو لە رۆمانەکانیدا سەرکەوتنی مێیانەی خۆی بەدەستهێناوە، دواجاریش دەرهێنەرانی فیلم ئەمەیان لەرۆمانەکانیەوە وەرگرتووە هەر لەو ساتانەی خێزانەکان نوقمن لەخۆشەویستی و کەشی ئارام تا ئەوکاتەشی کەبچووکترین کێشە لەنێوانیاندا هەیە، جین ئۆستن بەشانازییەوە باسی دەکات کەزۆر جار پێچەوانەی ژیانی خۆی بووە کە لەنێوان حەوت خوشك و برادا ژیاوە، بۆیە هەمیشە سینەما وەك وەفایەك لەسێبەری رۆمانەکانیدا دەمێنێتەوە، چەند جارێکی تریش سینەمای لێ بەرهەم دەهێننەوە[١٢].

## سەرچاوەکان:

١-ناصر العبد-سطور في عالم جين ئوستن- Fruat alwehda.gov

٢-جينْ ئوستن-عقل وعاطفة-ترجمة/رضا حواري.

٣-جين ئوستن-كبرياء و هوى-الجزء الاول/نبيل حليمي اسكندر.

٤-الموسوعة الحرة- Wikepedia.org

٥-شێلی ئیلیری-سەد ژنی کاریگەر لەمێژوودا-وەرگێڕانی/یوسف فەقیهی .

٦-ارنولد كيتل-مدخل الى الروايه الانكليزيه-ترجمه/هانى الراهب.

٧-ئیان وات-سەرهەڵدانی رۆمانی ئینگلیزی- وەرگێڕانی/رەئوف بێگەرد.

٨-احمد امين-النقد الادبي-الجزء الثاني-في تأريخ النقد عند الافرنج والعرب.

٩-بول دوتان-الادب الانكليزي-ترجمه/دار الفكر العربي.

١٠-سايت www.Neelwalfurat.com

١١- na suggestions@austen.com-linksc

١٢-فهد الاسطاء صحيفة الشرق الاوسط كبرياء وتحيز الرواية التي لاتملها السينما.

# خوشکانی برونتی
# قوتابخانەیەکی ئەدەبی

دووسەدەیە تێپەڕبووین بەسەر ئەو دیاردە ئەدەمیەژنانەیە کە لەوەوپێش نەبووەو دووبارە نایێتەوە لەمێژووی ئەدەبی جیهاندا کەباس لەو بزاڤە ئەدەبیە ژنانە یە دەکەین دەگەڕێینەوە بۆخۆرئاوا، چونکەخۆرئاوا پێشینەی سەرهەڵدانی ئەو بزاڤەیە ، سەرهەڵدانی شۆڕشی فەرەنسا لەکۆتاییەکانی سەدەی هەژدەدا بارودۆخێکی تری هێنایە گۆڕێ لەڕووی ئازادی ئابووری وکۆمەلایەتی وڕۆشنبیریشەوە هەروەك بوارێکی نوێی رەخسان بۆسەرهەڵدانی رۆژنامەگەری وەك لایەنێکی رۆشنکاری ، ژنان لەوگۆڕانکاریەدا دابەشبوون دواترژینگەیەکی ئەدەبی لەبار هاتەکایەوە لەزۆربەی خۆرئاوادا ژن کالآی ئەدەبی وزانستی ومێژوویی خۆیان خستە بازاڕی هۆشیاریەوە . خۆشکانی برۆنتی (شارلوت ١٨١٦ ئەمیلی ١٨١٨[*] ئان ١٨٢٠) لەو ئەدیب وشاعیرانە بوون کەخۆرسك دەیانووسی چیرۆکەکانیان هەلگری سەرگوزشتەی خۆیان بووکە ئەدەبەکەیان پێ فەراهەم دەکرد لەدوای خۆیان پرسیاری زۆر لەبلیمەتیەکانیان کەوتەوە خەلکیان تووشی سەرسوڕمان کرد. رەنگەقورس بێت تێبگەین بەپێی ئەوژینگە نامۆیەی کەخوشکانی برۆنتی (شارلوت وئەمیلی وئان ) دەیانووسی ناتوانین هیچیان لەوی تریان جیابکەینەوە بەپێشڕەوکردنی کەسایەتی هەریەکێکیان هەر بەهەمان رێگادا دەڕۆی لەبەر ئەوەی پەیوەندیەکی گرێدراووچنراوە ،تا کۆتایی نووسینیش هەر هەمان داوە ئەم پەیوەندییە گرێدراوە لەنووسینەکانیاندا بەتەنها ناگەڕێتەوە بۆ پەیوەندی گۆشت وخوێن ، بەلکو دەگەڕێتەوە بۆ هاوبەشیکردنی یەکتری لەڕاوبۆچوونی بیرمەندی و ویژدانی هەر لەسەرەتای منداڵیانەوە تا کۆتایی هاتنیان لەسەر رووی زەوی واتە تامردن هەر پەیوەست بوون بەیەکەوە . دیارە

هەندێك باسكردن لەديارەدەيەكی ئەدەبی وا لەخێزانێكدا پێویستمان بەراڤەكردنێك هەیە بۆكەسايەتيان لەرووی مێژووی تەمەنی ئەدەبی و باری كۆمەلآيەتيەوە . مێژووی خێزانی ئەو ئەدیبە ژنانە دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای سەدەی نۆزدە ، باوكيان (باتريك)ی ناوبوو خزمەتكاری كەنیسەی دەكرد پیاوێكی ئاینی ورۆشنبیر بوو ئارەزووی نووسینی شیعرو گێڕانەوەی چیرۆكی هەبوو، دايكيشيان (ماريا برانويل ) بوو ژنێكی هەست ناسك ورۆشنبیر بوو دەیتوانی نامەی جوان بنووسێ و گوزارشت لەناخی بكات بەڕوونی وئاشكرا ، بەلآم بزوێنەری يەكەم بۆ ئەم خێزانە باوكيان بووسادەترین ڕووداو بەزەینیدا تێپەڕیایە لە(ئەدەب وسیاسەت ومێژوو..هتد) بۆ مندالەكانی دەگێڕایەوە ، ئەم وێنەیەی باوكی لەقوناغی مندالی مندالەكاندا بوونە وێنەیەكی هونەری باترێك شەش مندالی هەبوو پێنج كچ وكوڕێك ، كچەكانی (ماريا و ئەليزابيس و شارلوت وئەميلی وجين وئان ) كوڕەكەشی( برنويل باتريكی) ناوبوو، ئەم خێزانە خێزانێكی دەولەمەند نەبوون ، بەلكو خێزانێكی گوندنشین بوون ، لەسەر گردێكی دەشتايدا نیشتەجێبوون دواتر بەهۆی تەندروستی دايكيانەوە مالەكەيان دەگوازنەوە لە شارۆچكەی تۆنتۆنەوە بۆ (هاورس) بۆ نیمچە دەشتايیەك و سروشتی پێگەردو رووبارو بەرزی ونزمیەكان هەرچەندە ئەم گواستنەوەیە سوودی نیە بۆ جەستەیەكی نەخۆش دايكيانی دەربازنەكرد لەوەی دنیا جێ نەهێلێت تەنها ماريا وئەليزابيس كەتەمەنيان هەشت سال وحەوت سال بوو هەستيان بەو غەمە گەورەیە دەكرد ئەوانی تر هەرگیز هەستيان بەچێژی تالی جيابوونەوە نەدەكردو دركيان بەوە نەدەكرد كەخێزانەكەيان چی لێ بەسەر دێت . بەمردنی دايكيان چارەنووسێك دەستيكرد بەنووسینی پالەوانەامەی تراژيدياى ژيانی ئەم خێزانە ئەو پالەوانەی كەدەبووە بزوێنەری چیرۆكەكانيان ، دوای مردنی دايكيان وردە وردە زەوقی نوسین بۆ ئازارەكانی ژيان تيايااندا سەرهەلدەدات ، هەستيان كرد ئەم جۆرە نووسینە بۆئەوان باشترە وەك لەنووسینەوەی خۆشیەكانی ژيان لەگەل ئەوەشی كەنووسین بەكردەیەكی رزگاركەری خێرا دادەنرا بۆيان ، چونكە لەودەمەدا باوەشێكی گەرم نەبوو تيا بحەوێنەوە تەنها پوریان

ئەلیزابیت برانویل خوشکی دایکیان ئەو باوەشە گەرمە بوو، کەجێی خوشکەکانی گرتەوە ، لەگەڵ ئەوەی کەسۆزێکی گەرمی نەبوو بۆیان ، بەلاّم تا دواساتەکانی تەمەنی مایەوە لەگەڵیاندا چارەنووسی وابوو ئەم تراژیدیانە ببینێ کە ئەم خێزانەی دەنووسیەوە کاسەکانی تاڵی یەك لەدوای یەك پڕەکرد لەگەڵ ئەم خێزانەدا بەتایبەتی باوکیان هەرزوو لەدوای مردنی دایکیان (ماریا) ی پێش تەمەن دوانزە ساڵ مرد بەنەخۆشی سیل هەرهەمان ڕۆژ (ئەلیزابیس) لەقوتابخانە گەڕایەوە توشی هەمان دەرت بوو نەیتوانی لێی ڕزگاری بێت ئەویش ژیانی بەجێهێشت پێش ئەوەی دکتۆر بتوانێت ڕزگاری بکات ئەمە وایکرد باوکی منداڵەکانی بهێنێتەوە ماڵەوە ولەسەر دەستی وانە بێژی تایبەت دەرس بخوێنن . لەبەر ئەم ڕووداوانە ئازارێك لەمنداڵەکاندا دروکەڵی لێ هەڵدەستا کاریگەری لەقولاّیاندا بەجێهێشت ژیانیانی داگیر کردبوو کاریگەری هەبوو لەسەر هەموو کارێك کەپێی هەڵدەستان یان هەرکارێك کە هەوڵیان بۆ دەدا ، ڕۆژبەڕۆژ ئازارو خەمەکانیان گەورەتر دەبوو لەگەڵ بیرکردنەوەیاندا پشتیان بەیەکتری دەبەست ، هیچ منداڵێك لەهاوتەمەنەکانیان بەشێوەی خۆیان نەدەبینی کەنزیك ببنەوە لێیان بۆیە تەواو گۆشەگیربوون لەهەمانکاتدا سوودیان لەو گۆشەگیریە وەرگرتبوو کەببوە پاڵنەرێکی زۆر بۆ نووسین و داهێنانەکانیان شتێك بوو جێی یاری وگەمەی بۆ دەگرتنەوە بەپێچەوانەی منداڵانی ترەوە . برنویل باترایك خۆی تەرخانکرد بۆ فێربوونی زمان بەتایبەتی زمانی لاتینی ویۆنانی لەبەر ئەوەی بەبۆ چوونی ئەو کاتە ئەوپیاوە دەبێت لەپێش کچە کانەوە بێت خەیاتی وکەیبانووی باشیش کاری کچانە ، وەك پووریان کچەکان لەسەر ئەو ئیشە ڕاهاتبوون ، بەلاّم لەهەمانکاتدا کچەکان توانیان بەرەو پێشەوە بچن ژیانی گۆشەگیری وخەمۆکی وهەستکردن بەئازاردکان وایلیکردن فشارێك دروست بێت بۆ تەقینەوەی ناخیان لەگەڵ جیاوازی تێڕوانینی کەسایەتی هەر یەکەیان شێوازێکی جیاواز هاتە ئاراوە . قۆناغی گرنگی مێژووی ئەدەبی ئەم خێزانە دەگەڕێتەوە بۆ قۆناغی منداڵیان ، بەلاّم ئایا ئەو ڕۆشنبیریە دیارێکراوەی کە لەماڵەکەیاندا هەبوو بەس بوو بۆئەوەی نووسەرانی جیهانی وەك شارلوت وئەمیلی و ئان

ئافەربىد بكات ؟ نەخێر کچێکی ئاگرینی وەك شارلوت کە هەمیشە سروشتێکی زانستیانەی هەبوو داوای زیاتری دەکرد لەگەڵ ئەو ژینگە داخراوەشدا کەتێی کەوتبوون ئەو هەلەی قۆستەوە کەباوکی بینرێتەپەیمانگای (روهیدی) بەرز ، کاتێك گەڕیشت بەرەو ئەو پەیمانگایە بەجلێکی کۆن وقژێکی ژاکاوەو کەقوتابیەکان پێشوازیان لێکرد بەگاڵتەپێکردنەوە بێ ئەوەی سڵ بکەنەوە لەوەی کەدەیڵێن یەکێك لەقوتابیەکانی پۆلەکەی پێی دەڵێت: شارلوت لەپیرەژنێکی بچکۆلەی شەرمن دەچێت تووڕەیە و تەبعێکی ناخۆشی هەیە وئەو تواناو بەرەوپێشچوونەی لە شیعروئەدەبدا هەیبوو توانی هاوڕێکانی راکێشێت بەلای خویدا کە ئەمەی بەتورەبوون بۆ بەدینەهات چوونی بۆ ئەم پەیمانگایە بۆ کات بەسەربردن و یاریکردن نەبوو وەك قوتابیەکانی تر کەزۆر بەیان لەچینی ئەرستۆکراتەوە هاتبوون ، شارلوت بەجدی کار دەکات ودەخوێنێت و دەچێتە ریزی قوتابیە پێشکەوتوەکانەوە .[1]

شارلوت لەرێگەی گێرانەوەی چیرۆکەخەیاڵی وپڕ واتاکانیەوە توانی سەرنجی زۆر لەهاوڕێکانی راکێشێ وشارلوت هەمیشە لەئازاری جیابوونەوەی دووخوشکە مردووکەیدا دەژیا زۆر جار باسی بۆهاوڕێکانی دەکرد بەتایبەتی لەو نامانەی کەبۆ ئیلینی هاوڕێی دەنارد هەرچەندە ئەو قوتابخانەیەی کەشارلوت تێیدا دەیخوێند کرداری زۆر لەهاوڕێکانی وایلیکرد کەسایەتیەکی پەرچەکردارانەی بۆ دروست بکات ، چونکە زۆربەی ئەوانەی لەوێ دەیانخوێند گوێیان بەخوێندن نەبوو ، هەربۆیە رووبەڕووبوونەوەی ئەو کچانە گیانی خۆڕاگری و رووبەڕوونەوەی تیدا دروستکرد هەتا بەرامبەر واقیعیش . ئەمیلی کەسایەتیەکی بەهێزی هەبوو لەبەر دەم ژن وپیاودا لەگەڵ ئەوەی ژنیارێکی باش بووە ئەدیبێکی بەتواناش بووە هەمیشە ئاواتی ئەوە بووە ببێتە کاپتنی دەریا ، کاتێ ئەمیلی تەمەنی چواردەساڵانەو ئان تەمەنی دوانزە ساڵانە بەشێکی ئەرکی فێرکردنیان دەکەوێتە سەرشانی شارلوت پاش ئەوەی لەو پەیمانگایە دەگەڕێتەوە هاوکات لەگەڵ ئەو مامۆستایەی کەباوکی گرتبووی بۆیان ئەمیلی وئان فێری پەروەردەو زانست دەکەن . ئەمیلی وشارلوت دواتر دەگەڕێنەوە

بۆ پەیمانگا ی روهید وەك مامۆستایەك لەساڵی ١٨٣٥ وانە دەڵێتەوە ئەمیلی مامۆستای مۆسیقایەو شارلوت مامۆستای ئەدەب لەگەڵ ئەمەشدا ئەمیلی بیرۆکەی نووسین هەردەم لەمێشکیدا بوو شارلوت –یش بەهەمان شێوە ئەوەی کە پاڵەپەستۆی خستبووە سەربان و پاڵی پێوەدەنان چەکوشی راستی و ویژدان بوو بەرەو نووسین ، شارلوت کۆمەڵێك شیعری داناوناردی بۆشاعیری ئەو سەدەمە ساوسی ئەویش لەوەلامدا بەم شێوە وەلام دایەوە: جەختکردەوە شتێك هەیە رۆژانە دەیان شاعیر شیعرەکانیان بلاودەکەنەوە بەلام کەس گوێیان لێ ناگرێت بەبۆچوونی ئەو پێویست ناکات ژنێك گاڵتە بەشیعربکات . ئەم قسانە چۆکیان بەشارلوت دانەدا ، چونکە ئازارەکانی لەوە گەورەتربوون ، شارلوت چیرۆکەکانی لەتاریکیدا گەورەکردبوون و دەیگێرانەوە دوور لە گوێلێبوون وبینیەکان . ئان دەستی وێنە کێشانی هەبوو هاوکات چیرۆکیشی دەنووسی ئەم خوشکانە چیرۆك و شیعرەکانیان لەدنیای تەمەنی بالقیاندا گەشەی کردبوو دواتر دەستیان دایە نووسینی چیرۆکی ئەفسانەیی . نووسین دادی نوسین دادی ئەم خوشکانەی نەدا لەرووی ئابوورییەوە بۆیە ناچار لە پاڵ نووسیندا ئان وشارلوت وەك دوو پەروەردەکار (مربیە) دەچنە ماڵێکی نامۆوە لەچینێکی هەوادارا دا مامەڵە دەکەن کە ئەمەش رەنگدەداتەوە لەهەر دوو چیرۆکی (جین ئیر) ی شارلوت برۆنتی و(ئەجنس جرای) ئان برۆنتیدا ، ئەم ئەم بەرهەمەی ئان لەگەڵ (وەزرنج هیتس) ی ئەمیلیدا ساڵ ونیوێك دەستاودەستی پێکرا لەژێر چاپدا ، شارلوت لەپێشەکی وزرنج هیتسدا "" دەڵێت کتێبەکانمان لەسەرەتادا چاپ نەکران هەروا مایەوە بەتایبەتی دەستنووسەکانی من هەرچەندە دوای مردنی ئان (ئەجنس جرای) لەماوەی یەم مانگدا سێ جار چاپ کرایەوەو وەك یەکەمین رۆرمانی ژن ناوبانگێکی گەورەی دایەوە . ئەوە شتێك بوو چاوەڕوانمان دەکرد هەر لەسەرەتاوە خۆمان لەسەر ئەوە راهێنابوو شتمان زۆر لەسەر ئەزموونی خەلکانی تر خوێندبووەوە لەم لایەنەوە شارەزایمان پەیدا کرد بوو ئەوەی کەزۆر دوودڵ بووین ئەوەبوو کەوەلامێکی بلاوکراوەکانمان پێبگات بەشێوەیەکی نائومێدانە لەم کێشەیەشدا ئازایەتیم دابووە بەر خۆم بەو ئامۆژگاریەی کە

لەبەرێزێکی وەك (تشیمبرز) بیستبووم لەچاپەمەنی ئەدنبرە . ئەو باروودۆخەم بیرچووەوە ، بەڵام شتێك کەبیرم نەچووە وە کاتێك کاتێك کەبابەتەکەم قبوڵ نەکرا بەکردەیی ناردیانەوە بۆم بەشێوازێکی ئەقلانی ناسکی وا کە لە ناردنی دیاریەك دەچوو کەدوایش توانیمان سوود لەو کردارە وەربگرین و سەرکەوتین ، کتێبە کانیش چاپکران ئەوەی کە تائیستا دیارنیە پێویستە بیزانین شیعرەکانی ئەملیی (ئەلیس بیل) بوو من خۆم بەراستی قەرزاری باوەڕهێنان بەنرخی ئەو شیعرانەم لەکاتێکدا زۆر یك لەرەخنە گران بەدڵیان نەبوو . بەڵام من وەك شارلوت ( کورربیل ) هەر پابەندم بەباوەڕی خۆمەوە[٢] .

(مرتفعان ویزرنج) بەرهەمێکی تری ئەمیلییە لەسەرەتا لەلایەن رەخنە گرانەوە بەبەر هەمێکی ئالۆزلەقەڵەم درا ، بەڵام دواتر بەبەر هەمێکی باش ناوبانگی دایەوە(٣) . سەبارەت بەر..ازی نووسینیان شارلوت بەم شێوەیە باسی شێوازی نووسین و رەنگدانەوەی چوونیەتی قەڵەمەکانیان دەکات ، زۆرێك لەخوێنەران گومانیان هەیە لەوەی کەهەموو ئەو شوێنەوارە ئەدەمیانەی کەبلاوبوونەتەوە لەژێرناوی ئەم سیانەدا (کورربیل وئەلس بیلّ و وانەکتن بیل ) هەموویان لەراستیدا بەرهەمی یەك قەڵەمن ویستم ئەمە هەر لەو کاتەوە راست بکەمەوە، کەچاپی سێیەمی چیرۆکی (جین ئیر) دەرچوو بەدەستەواژەیەکی دیاریکراوی وا کەئیتر ئەو وەهمە بڕەوێتەوە بەوەی کەنازی ناوی (کورربیل) شارلوت بڕێتیەوە (ئەلس بیل) ئەمیلیەو(ئەکتن بیل) ئان ــە .

بەڵام ئەم دەستەواژانە بوونە شتی ترو جێگەی راستە قینە یان نەگرتەوە لەسەر هەردوو چیرۆکی (ئەجنس جرای) ئان و(وزرنج هیتس)ی ئەمیلی قسە وباسی زۆر سەریانهەڵدا کە لەوەختی خۆیاندا نەبوو، یەکێك لەو خالانەی کەلەسەر(وزرنج هیتس) وترا بەهێزەو بەرهەمێکی ناتەواوە ، بەڵام پێگەیشتنەکەی لەبنەڕەتدا بەهێزەو ساختە کاری تێدا نیە(٢) . ئەو بۆ چوونانە هەر چەندە هەڵە بوون لەتێگەیشتن وربازدا سروشتی ئەو هەڵەیەش بۆ کەسی نووسەرەکەی دەگەڕێتەوە ، خالێکی تر کە هەر لەسەر ئەم چیرۆکە وترا ئەوەبوو ئەم چیرۆکە بەبەرهەمی تەمەنێکی تازە پێگەیشتواندا ناوبرا کەهێشتا قەڵەمەکەی زۆری ماوە

بۆ ئەوەی بگاتە ئەو قەڵەمەی کە (جین ئیر)ی پێ نووسراوە کەچیرۆکی شارلوتە . شارلوت لەم بارەیەوە کەتێی کەو توون هەرچەندە لەوەختی خۆیدا پێکەنینم بەمە دەهات ، بەلاّم ئیستا بەداخەوەم بۆی داخێکی زۆر قوڵ ئەوەش وایلێکردم نەترسم لە قورساییە کانی نووسین ، نووسەر دەتوانێت چیرۆکێکی خراپ بەرگی چیرۆکێکی تری سەرکەوتووی بەبەردا بکات هەر چەندە رەنگە قورس بێت کاریگەری بەرهەمێکی لاواز بەقەڵەمێك ببێتە بەرهەمێکی بەپێزتر"***" .

کاتێك ئەمیلی وئان (وزرنج هیتس ) و(ئەجنس جرای ) یان نارد بۆ بلاّوکراوەکانیان شارلوت چەند دەستنووسێکی دەنێرێت ، بەلاّم سەیر لەوەدایە بەچەند مەرجێك چیرۆکەکانی ئەوان قبوڵ دەکرێت ، بەلاّم دەستنووسەکانی شارلت لەماوەی ساڵ ونیوێکدا هەموو جارێك کە دەینێرێت رەفزدەکرێتەوە ئەم قبوڵ نەکردنە ناخی نەکوشت هەوڵی زۆر تریدا بەهەموو توانایەوە بۆرێگەی سەرکەوتن دەڵێت چیژێکی سەیرە نوسین هەمیشە سووربوون لەهەوڵدان هەریەکە لەئێمە بۆ نووسین گەیشتن چارۆ کەکانمان هەڵدەکرد . کاتێ ئەو دەستنووسانە لەهیچ دەزگایەك قبوڵ نەکرا بۆبلاّوکردنەوە دواتر خانەیەکی تر تاقیدە کاتەوە ئەویش خانەی (سمس و هاوکارەکانییەتی) . ئەوماوەیە ماوەیەکی هێندە نەبوو بەدوور دێر وەلاّمێکی بۆ دەنووسن کەئومێدی تێدا حەشاردراوەوئەو بلاّوکرایەوە ئاگاداریان کردەوە (ئیستا ئامادەنین بۆ بلاّوکردنەوەی دەستنووس) لەهەمانکاتدا نامەیەکی لەگەڵدا نێردرابوو بەوەی کەئیستا لەبەر هۆی بازرگانی بلاّوکراوەکە یان چیرۆك بلاّوناکاتەوە هەروەها لایەنی بەهێزوبێ هێزی چیرۆکەکە بەشێوازێکی سەرنج ڕاکێش شرۆڤەکرابوو بەرۆحێکی سەنگین لەڕەخنەیەکی رۆشندا . شارلوت دەڵێت لەم کاتەدا بوو کۆتایم بەچیرۆکی جین ئیر هێنا کەزۆر لەمێژەوە نووسیبووم لەگەڵ ئەوەی کە لەیەك

بەرگدا نووسیبوم لەلەندەن سێ هەفتە زیاتری نەبرد ناردیان بۆ بڵاوکردنەوە سەرەتای مانگی سێپتەمبەری ١٨٤٧ بوو لەکۆتایی ئۆکتۆبەردا چاپکرا لەگەڵ ئەوەی کە هەردوو چیرۆکی (وزەرنج هیتس )و(ئەجنس جرای) هەروەها خۆیان مانەوە لەدەستی بڵاوکراوەکانی تردا کەچاپی ئەم دوو چیرۆکە زۆر لەپێش چیرۆکەکەی منەوە دەستیان بەچاپ کردبوو.( ٤ ــ ٥) لەماوەی ئەوپێنج ساڵەی کەدەمانووسی لەژێر سەقفی ماڵێکدا چەند جارێك بۆ ماوەیەکی کورت لێکتر دابڕاین هەریەکێك لەئێمە لەگۆشەیەکی خانووەکەدا دەمانووسی وخوێندەواریمان زۆر نەچووبووە پێشەوە تەنها کەمێك نەبێ ، نەمانتوانی تێکەڵاوی هیچ کەسێك بکەین لەدەرەوەی خێزانەکەماندا پشتمان بەرۆیشتنی ژیان بەستبوو ، بەڵام ئەم هێزە بوو کەهەوڵی سەرکەوتنی نووسینی ئەدەبی پێدەداین یەکەم پلیکانەی سەرکەوتن ئەوە بوو کەهەریەکەمان لەسەر ئەوی تر دەمانووسی ئەمە ئەوشێوە نووسینەبوو کە لەسەرەتادا لەسەری راهاتین هەر بەو شێوەیە لەیەکتر گەیشتنە راگۆڕینەوە راهاتین تا دواساتەکانی ژیانمان شارلوت دەڵێت : لەرۆژێکی پایزی ساڵی ١٨٤٥ بەرێکەوت چاوی بەکۆمەڵێك دەستنووسی شیعری ئەمیلی کەوت کە بەخەتی خۆی نووسیبووی سەرسام نەبووم بەوە چونکە ئەوە شتێکی ئاسایی بوو کە ئەو توانایەکی باشی هەبوو شیعرەکانی شیعری ئاسایی نەبوون ، ئەندێشەی پڕبوو لەوردبینی وبەهرەی شیعرەکانی تێدا جێکردبووەوە، هێزێکی زۆری تێدابوو لەدێڕەکاندا گوێی مۆسیقی سەیرهەمیشەهەست پێدەکرا دێڕەکان مۆسیقای خۆیان و خەمگین و بەرزکردنەوەی ناخی تێدابوو ، کەسایەتی ئەمیلی وا بوو حەزی بەخۆی هەیە ، دڵنیاوهێمن بوو لەسەر سندوقی فکرو شاردنەوەی ناخ وا هەست وقەناعەتی لەلا جێدە هێشتی کە رۆژ ێك هەردێ شیعرەکانی شایەنی بڵاوکردنەوە بن . ئەلیس بیل و ئەکتن بیل واتە ( ئەمیلی وئان ) بەبلیمەتی

خۆیان نەگەیشتن ئەوەبوو مەرگ یەخەی ئەم خێزانەی بەرنەدا هەر لەدوای مەرگی ئەمیلی لەساڵی ١٨٤٩ ز بەچەند مانگێك باتریکی برایان لەهەمان ساڵدابەدوای ئەویشدا ئان کۆچی دوایی کرد . کەواتە بەدرێژایی ژیانی خێزانیی ئەم خێزانە لەبەردەم هەڕەشەی مەرگدابوو هەر ئەمەش بوو وایکرد ژیانی گۆشەگیری وترس هەوێنێك بۆ نووسینەکانیان بڕەخسێنێت ، ئەوەتا ئەگەر ئەوا لەنزیکەوە خوێندنەوەیەکی کورت بۆ چیرۆکی (وزرنج هیتس) ی ئەمیلی بکەین هەر ئەو هەوێنی گۆشەگیریەیە کەزبرو وشکە لەتێکە پشتنە کەیدا ، بەلآم هەست بەچاکە کاریەك دە کەین لەچیرۆکەکەدا لادێ نشینێك توندو رەق لەسەرەتاوە تا کۆتایی ئاودامان بەربەری ورووت وەکو درەختێکی بەربەری ئەمە سروشتی فیگەری تابلۆی ئەو چیرۆکەیە ، هەر وەکو هەمان ووشکی وتێنەگەیشتنێکی ماوە درێژ لە(مرتفعات ویزرنج) یشدا هەبووە . سەبارەت بە(جین ئیر)ی شارلوت کە بەبەرهەمێکی گرنگی شارلوت دەژمێردرێت گەر لەهەمان روانگەوە خوێندنەوەیەکی کورتی بۆ بکەین راچڵە کێن و سەر کێشی ومرۆڤانەی پێوەدیارە ، شەرۆڤەی ورد ترین هەستی خۆشەویستی و رەق و داخ وپەشیمانی دەکات تابلۆیەکەلەتابلۆکانی دافنشی ورافائیل ، خەمێکی دیل لە قوڵایی دڵە کاندا هەیە لەژوورێکدا کەشەوەو دەیخوێنێتەوە دەتوروژێنێت ئەو رێگایە دەتبات بەرەو نادیار . هەر دێڕێك لە(جین ئیر ) وەرگیراوی ژیانی شارلوت خۆیەتی ، لەگەڵ ئەوەشدا جین ئیر رووداوێکی ئەدەبی گرنگە شارلوتیش بەیەکێك لەمەزنترین ژنە رۆ ما ننووسەکانی جیهان دادەنرێت بەدرێژایی مێژوو . ئەو مەزنە لەوەدا دەردەکەوێت کەشوێنەوارە مەزنیەکانی بەبێ کەموکورتیی نووسەرەکان و وەرگێڕەکان وەریان گێڕاوەتە سەرزمانی بێگانەکان ، زۆر جار وەرگێران بەتەواوی دەشیوێنرێت بەلآم ئەم بەرهەمەی شارلوت (جین ئیر) وەرگێڕانێکی بەپێزی بۆ کراوە یەکێك لەو

وەرگێرانانە بۆ زمانی عـەرەبی وزمانـە ئەورووپیـەکانی تروەرگێـڕدراوە(٤ ــ ٥) ، لەوەرگێڕانە عەرەبیەکەیدا دێڕێکی لێ کەم وزیاد نەکراوە بەدەگمەنیش لەگـەرمی بابەتەکـە سـارد نەکراوەتـە هـەروەك دەقـە ئەسـڵیە ئینگلیزیەکـە بەهەمان خەسڵە تەوە مامەڵەی لەگەڵدا کـراوە . شـارلوت برونتـی لەسـاڵی ١٨٥٥ وەك دوا منداڵی ئەم بنەماڵەیە کۆچی دوایی کردووە خۆی لەژیانـدا بوو کە بەرهەمـەکانی بەچاپ دەگات تەنانەت خـۆی پێـشەکی بـۆ نووسـیون هەروەها لەجین ئیر دا لەبەشێکیدا بەم شێوەیە نووسیویەتی :لـەم ڕۆژگـارەی ئیـستادا پیاوێـك نیـە وشـەکانی لەگوێـدا ناسـك بـن ، پیاوێـك کـەهێزو زیندوێتی تیدا بێت بەقەد پێغەمبەرێکی ئازاو چاونەترس . بۆچـی بـۆ ئـەو پیـاوە دردوشـاوەیم وبدرەوشـێمەوە بـۆی ؟ ئـەی خوێنـەر کـەبیینم هوشـیارو بیرمەنـدێکی قـوڵی لـەم چـەرخەدا ئارامگربەکـەناوی دەنـێم چـەرخی کۆمەلاّیەتی ، ..." ⁂⁂

پەراوێزەکان :

* ساڵی لەدایکبوونی ئەمیلی لەنساو رائدات (٤)/ ئەمیلی نصراللەساڵی ١٨١٨ ز بەلاّم لەچیرۆکی (وزرنج هیتس) لەپێشەکیە کەدا بەساڵی ١٨١٩ دانراوە

** شارلوت برونتی لە (وزرنج هیتس) ی ئەمیلی برۆنتەوەك پێشەکیەك نووسیویەتی .

*** شارلوت برونتی لەپێشەکی (وزرنج هیتس ) ی ئەمیلی برونتی دا نوسیویەتی.

**** شارلوت برونتی (جین ئیر) لەپێشەکیدا .

سەرچاوەکان :


١. املی نصرالله – نساء رائدات من الغرب (٤).

٢. املی برونتی – وزرنج هیتس —ت/ انور الحناوي.

٣. املی برونتی –مرتفعات ویدزنج –ت/ الدار الیقظة العربیة للتا لیف والترجمة و النشر-دمشق –سوریا

٤. شارلوت برونتی –جین ئیر –ت/منیر البعلبكي

٥. شارلوت برونتی –جین ئیر –ت/لانا ابو مصلح .

# ( مرتفعات وزەرنگ )ی ئەمیلی برۆنتی

(مرتفعات وزەرنگ) وەکو هەرکارێکی هونەری گەورە ، تایبەتمەندو گشتگیرە لەیەك کاتدا ، ناوخۆو جیهانیە ، چونکە زۆر لەوکتێبانەی دەنگیان داوەتەوە باسیان لەخوشکانی برۆنتە کردووە . بەتایبەتی ئەمیلی شتی زۆری پێشکەش کردووین وەکو وێستگەی تارمایەك وابووە لەزەویەکی بەیاردا کوتایی نیە ، لەهەمووشتێك کەوەچەی کۆمەلگای مەردوم هەیەتی دابڕا و بووە ، هیچ پەیوەندیەکی بەزەمەنەکەی خۆیەوە نەبووە تەنها بەنەبەدیەتەوە نەبێت ، لەسەرەتادا ئەگەرجەخت لەتایبەتمەندی وجەوهەری نوسینی(مرتفعات وزەرنگ ) بکەینەوە دەبینین ئینگلتەرا لەسالی ١٨٤٧ لە سالانی پێشکەوتنی دا خەلکانی بەرەو پێش چوو ئەو خەلکانە بوون کەلە یورکشیر دەژیان ، نەك لەسەر ئەو زەو... کەهەرگیز بوونی نابێت .

هیسکلیف لەسەرلاپەڕەکانی بایرۆن لەدایك نەبووە بەلکو لەگەرکێکی ناخۆشی بلیفێر پولە هەروەها زمانی نیللی وجۆزیف وهارتون زمانی دانیشتوانی یورکشیرە ، چیرۆکی ( مرتفعات وزەرنگ) خۆشەویستیەکە لەشێوەی ئەبستراکیتدا نیە، بەلکو سۆزی خەلکانی زیندووە کە هەیانەتوانای ڕاکیشانی کۆمەلگایان هەیەو هاوسەرەکان ڕێك دەخەن وگرنگییەکی پەروەردەیی وریفۆرمی وئایین وپەیوەندییان لەنێوان هەژارو دەولەمەندا هەیە .

هیچ شتێکی شاراوە لەم ڕۆمانەدا نیە ، ئەگەر باس لەڕەگەزەتایبەتمەندییەکانی بکەین ، هەلگری دەنگی خوێنەتی کەناتوانین لەماوەی تەمەنی کورتی مروڤدا وێنەی بگرین بەشێنەیی دەگۆڕێت ، مەبەست لەم گوتەیە ئەوەنیە کەئالۆزە بەپێچەوانەوە گەیشتن پێی زۆر هەستیارە : ئێمە بوتی چێشتخانە دەکەین لە(مرتفعات وزەرنگ )دا وەهەستیش بەبایەك دەکەین لەبەربەربەتەوە هەلدەکات وە ئێمە لەنێو کرۆکی گۆڕانکاری وەرزەکاندایین ، ئەم هەست پێکردنە لەووردی بابەتەکەوە دێت نەك لەتەم وەژەوە .

گرنگـه جـەخت لـەم خالّـە بکەینـەوە کـەهێزی ئـەم ڕۆمانـەی ئـەمیلی بـرۆنتی و سەرسوڕمانمان پێی وەسفێکی ئاساییە، بەڵام ئەگـەر بـەهۆی شیکارێکی ووردو درێـژەوە بۆی بـڕوانین لەڕوانگـەی ژیـانی کۆمەڵایـەتی وبابەتـەکانی ڕۆژگـارەوە بەئاشکرا جیـاوازن لەوبابەتانەی جین ئۆستن دەیانخاتە ڕوو ، گەر لێی ووردبینەوە زیاتر لەبابـەتی چیرۆکەکانی ( دیکنز )ەوە نزیکە، لەڕاستیدا (مرتفعات وزەرنگ )لەجۆری ڕۆمانی (ئـۆلیڤر تویـست)ە ئەمەنەڕۆمانـەو نەئەوفیلمەشـە کەئـەو ناونیـشان یێـت ڕاکـردن لـەژیان بۆبەربەریـەتی وەحـشیەت وعاشـقانی ڕۆمانتیـك ،بـێ گومـان ئـەوە ڕۆمـانێکی پڕوپـوچ نیـە نـاتوانین واوەسفی بکەین کە گرێچنێکی ئەخلاقیانیە لەگەڵـەوی ڕێکخـستنێکی بەهێزوگـەورەی تێدایـە ، ئـەم ڕێکخـستنە وەك بۆچـونی دیکنـزە ناتوانینەمـە تەنهالەڕسـتەیەکی جـوان وبیروباوەڕو تێگەیشتنێکی ڕۆشنبیریاندا ببینینەوە .

ئەمیلی برۆنتی ئێش لەسـەرهزر ناکات بەڵکو بەوێناکان ئامانجەکانی دەگەیەنێت واتـە بەو دەستەواژانەی دەلالەتێك یان هەیە تۆکمـەیی لەوەدایـە کەبەرێگـەیی خـۆی هزرێکـی لۆژیکیانە دەردەبڕێت واتە ئەگەر هەریەکـە لـە(ئـۆلیڤر تویـست ) ی دیکنـز و(مرتفعـات وزەرنــگ )بەکۆمــەڵێك ووشــە دارێــژرابن کــەلۆژیکێکی ســاردن ئــەوامانای ئەوەنیــە کەلەوشـوێنەدا لـوژیکی تێدانیـە ڕۆمانـە سـیمبولیـستەکان کـاری هونـەری گـەورە دەبەنەپێشەوە لەڕێگەی خەرافەی ئەخلاقیەوە واتا لەڕێگەی سـیمبولێکەوە یالەتێگەیـشتنی ئەخلاقیانەوە زۆرتر وزیاتر دەتوانین بگەینە ژیان بۆنمونـە ئەوڕسـتەیەی کـەدەڵێت : "مـرۆڤ سەربەستانە لەدایك دەبێت ، بەڵام لەکوێدایبەوێت دیوارێك دروست دەکات ...." .

(مرتفعات وزەرنگ ) ڕۆئیایەکە ئەوکاتەی تێیدایە ژیانێکە سـاڵی(١٨٤٧)ە یـابوون وبۆچـونی ژیـان وهـەمووژیان تـەنها لەچـوار چێوەی ڕوکشـێکی سـادەدایە ، پەیوەنـدی خێزانـەکان ئـاڵۆزتر دەکـا کتـێکـی هێنـدە بـەپێزە کەلەتوانایدایـە هەمووکێشەئامێز سازیەکان بەچاودێریـەکی ووردەوە چارەسەریکات ، بۆپێشکەوتنی بابەت وکەسایەتیەکان ڕۆڵی هەردووگێڕەرەوە لوکۆدو نیللـی دەبینێـت .لـە قـسەی ئـەم دوو ڕاوبـەوە کەپـەیڤێکی

راقعی ونویَ نین زیاتر لەهونەری سیمبولیزمەوە نزیکە ،لەگرنگترین ساتی گێرانەوەدا ناگامان لەهەبونی ئەو دووگێرەرەوەیە نامێنێ نوسەر واینەکردووە کە گووتەکانیان لە راقیعێکەوەنزیك بێت کە هەست بەناوخۆیەتی بکەین ،واتە خۆیان نەسەپاندووە بەسەر دیمەنەکاندا لەکاتێکیدا زۆرجار ڕۆڵی گرنگیشیان هەیە .

یەکێك لەناسکییەکانی ئەم کتێبە ئەوەیە ئەو رێگەیەی کەگۆڕانکاری تێدا دەکات لەهەڵوێستەوە بۆبەرەو پێش چوونە ، فلوکودو نیللی فێردەبن ئەوەی کەپێی دەژین وەك نیمەیێت لەگەڵ ئەوەی مانەوەیان لەسنورێکدا لەسەرەتادا بوتللی زۆر گرنگە ،وەکو شتێکی باو کەدەبینین لوکود توشی شوك دەبێت لە(مرتفعات وزەرنگ) دا ، بەرێزفیکتوری کەلەخێزانێکی مامناوەندە رق وکیبرکێ وترس خواردویەتی ئەوەی دەبینین ئیمەش توشی شوك دەکات ،لێرەدا بەئارەزووی خۆمان بەرەوپێش چوونی ناسوی ئەخلاقیەت وکۆمەڵایەتی ورۆحمان دەست پێدەکات .

جەوهەری بابەتەکە وسەنتەری کێشەکە چیرۆکی (کاسرین وهیسکلیف )ە چیرۆکەکە بەچوار قوناغدا تێدەپەرێت ،بەشی یەکەمی باس لەو پەیوەندییە دەکات کەلەنێوان کاسرین وهیسکلیف دا دروست دەبێت هەروەها هەلگەرانەوەیان بەسەر هەندلی وزژیمەکەیدا پانتاییەکی بەر بلاویان هەیە لە(مرتفعات وزەرنگ) دا .

بەشی دووەمی ئەو کتێبە باسی خیانەتی کاسیرینە بەرامبەر هیسکلیف ، ئەگاتە شوینەکەی لەمردنەکەیدا ، لەبەشی سێهەمیشدا چارەسەر دیاری دەکات بەوەی هیسکلیف تۆڵە دەکاتەوە ، کوتاییەکەشی کۆشکەکەیە وئەو گۆڕانەی بەسەر

هیسکلیف داهاتووە دەیگێرێتەوە لەگەڵ برینداری ومردنەکەی ولەگەڵ مردنی کاسرین ، ئەم دووبەشەی کوتایی پەیوەندارن کوتترۆڵی هەمووڕووداو بابەتەکانی پێشوش دەکات .

ناسان نیە مرۆڤ بەووردی بریار بدات لەسەر جۆری ئەو هەست وسۆزەی کەکاسرین وهیسکلیف بەیەکەوە دەبەستێت وەکو دەڵێن زۆرجاریە پێچەوانەوە ئەمیلی برۆنتی

ناترسێت لەخۆشەویستی سێکسی ، مەشهەدی مردنی کاسرین بەشێوەیەکی تەواو جەخت لەوە دەکاتەوە کەئەو خۆشەویستیە عاتیفەیەکی ئەفلاتونی نیە ، بەڵکوئەوە تەنها بەخۆشویستن غەریزەی جنسی دەردەخات ، ئەوەتا کەگوێ لەکاسرین دەگرین هەستی خۆی بۆ نللی دەردەبڕێت (لەبەردەم شوکردنیدا بەلنتۆن ) : " نازارەگەورەکانی من لەم جیهانەدا ئەوئازارانەن کە (هیکلیف ) دەیچێژێت ودەستی خستوتەملی هەردوکمان و هەرلەسەرەتاوە هەستمان پێکرد گەورەترین بیرکردنەوەی من لەژیاندا ئەوە ئەو ، ئەگەر هەموشتێ بەسەر بچێت ئەو دەمێنێتەوە ، وادەکات منیش بمێنم وەئەگەر هەموشتێ بمێنێت وئەو کوتایی پێ بێت جیهان دەگۆڕێت بۆئاوارەیەکی بەفیرۆ چوو ، هەرگیز من بەشێك نابم لەو ، خۆشەویستیم بۆلنتۆن لەگەڵاکانی دارێك دەچێت لەجەنگەڵێکی سەر زەوی ، زەمەنیش دەیگۆڕێت ، هەروەك چۆن زستان دارەکان دەگۆڕێت ، من بەتەواوی دەزانم خۆشەویستیم بۆهیسکلیف لەژێر بەردێکی ئەبەدی دەچێت :

سەرچاوەیە بۆدڵخۆشیەکی بچوکی مرۆڤانە ، بەڵام پێویستمە ، نللی من هیسکلیف ! هەمیشە ئەو ، هەمیشە لەهزرمدایە ، نەك بۆلەزەت بەقەدەر ئەوەی بۆخۆشیەکە لەخۆمدا ، بەتایبەت ئەو هەموو کیان وبوونمە .

کەکاسرین دەناڵێنێت هیسکلیف هاواردەکات : " ناتوانم بژیم بەبێ ژیانم ، ناتوانم بژیم بەبێ ڕۆح " لێرەدا تێبینی ئەوە دەکەین ، ئەم بەیەکدا چونە حاڵەتی سێکسی تێدەپەڕێنین وشتێکە تەنها بەخۆشەویستی ڕۆمانسیانە وەسف ناکرێت .

لەزۆربەی دیمەنەکانی (مرتفعات وزەرنگ ) دا زمانێك هەیە جیهانێکی فراوانی شیعری کەدیمەنەکانی پێ وەسف دەکرێت هێزدەداتە چیرۆکەکە بۆنمونە هەڵگەڕانەوەی کاسرین و هیسکلیف دەست نیشان کراوە بەوەی کەئەوان خەونێکی ڕۆمانسیانەیاندیاریان نیە ، هەڵگەڕانەوەیان لەسەر بنچینەی دژایەتی کردنی ڕژێمەکەیە .

مردن گرنگی یەکی ئەوتۆی نیە لە(مرتفعات وزەرنگ ) دا ، لەبەر ئەوەی ئەوبابەتانەی ئەو ڕۆمانە گرنگی پێدەدا گەورەترە لەژیان ومردنی دووکەس ، لەووتارێکی

نایابدا که دیفید ولسۆن لەسەر ئەمیلی برۆنتی نوسوویەتی " لەگەڵ ئەوەی لەزۆر شتدا کەئەو شرۆڤەی کردووەمن کوك نیم بەڵام ئێمە قەرزاری ئەوین " جەوهەری کێشەکان لەم رۆمانەدا تایبەتە بەسەردەمێکی تایبەتەوە کەسەردەمی فیکتۆریە ، هەڵگرانەوەی هیسکلیف هەڵگەڕانەوەیەکی تایبەتە ، کرێکارێکی داخ لەدڵی مادی ورۆحی پێی هەڵدەستێت لەرێگەی ئەو پەیوەندیانەی کەهەیە تی لەکۆمەڵە کەیدا ، ڕاستە هیسکلیف یەکێکە لەوانەی دەچەوسێنرێتەوە هەر لەزووەوەیاخی دەبێت لەگەڵ کاسرین دا بەڵام ڕاستریشە بڵێین ئەوەکەجارێکی تر چینی دەسەڵاتدار بنیات دەنێتەوە چونکەرەفتاری مرۆڤانەی لەکەمبوندایە لەو پەیوەندییەی کەلەگەڵ (کاسرین) داهەیەتی ، هیسکلیف و ئەوانەی وەك ئەون دەشێت ئەوە بەدەست بێنن کەلە رێگەی یاخیبوونێکی کردەییەوە تەنها لەسەر ژێر دەستەکان بکاتەوە ، کەواتە (مرتفعات وزەرنگ ) گوزارشت کردنە لە هێزو توند و تیژی ودژایەتی کردن چ وەك کەسایەتی چ وەك دەروونی لەکۆمەڵگای سەرمایەداری سەدەی نۆزدەدا ، رۆمانێکی بێ هاوتایە و بێشتی هەڵەو هەرزەیە وبێ پەرو پاگەندە کردنە بەوەی هێزی دەرەوەوتوانای مەردوم دەتوانێت کوتترۆڵی کێبڕکێی کارەکانی بکات ، بانگەوازێکی بەهێزە بۆسروشت بۆ بەربەرییەت بۆ زریان وئەستێرەو وەرزەکان ، بەشێکی بنچینەییە لەکەشف کردنی بۆ جموجوڵەکانی ژیان خۆی ، نەژن ونەپیاو تێیدا بەندی سروشت نین ، هەردوکیان لەجیهاندا دەژین وهەندێکجار دەیانەوێت ئازاروخەم وهەڵەو تەنگەژە بێ کوتاییەکان بەسەرکەوتن بگۆڕن .

ئەو دژایەتی کردنە کوتایی نایەت ئەوانەش دەگرێتەوە کەدژی کۆمەڵگای چینایەتین ودەیانەوێت بۆکۆمەڵگایەکی بێ جیاوازی وپێشکەوتووی زیاتر ئینسانی بەرن ، ئەم رۆمانە زیاتر دەگاتە هزرمان لەبەر ئەوەی رۆمانەکە لەواقعی هەستماندا وێنەی کێشراوە چونکە جۆری ئەو چەوساندنەوەیە ی تێیدایە بەشێوەیەکی ئەبستراکێت وشاراوە نیە ، بەڵکو دیاری کراوە، لەبەر ئەوە دەبینین رۆمانەکەی ئەمیلی برۆنتی ئاشکرا کردن و ڕوون کردنەوەی ئەو ژیانەیە کەدەیناسێت ژیانی فیکتۆریەتی ئینگلتەرە ، ئاشکرا کردنی ژیانێکە

بەرۆچوونەکانییەوە ، فێرجینا وولف لەبارەی ئەو ڕۆمانەی (ئەمیلی برۆنتیی) یەوە دەڵێت : هەست بەئامانجێکی باڵاتما دەکەین لەم ڕۆمانەدا ، بەدژایەتیەکی نیوە شاراوەبەڵام ئەو شتانەی لەزمانی کەسایەتیە کانەوەدەوترێت جوان وباوەڕ پێ هێنەرن ، تەنها ((خۆشەویستی)) یان ((ڕق )) نیە وبەس بەڵام ((ئێمەی ڕەگەزی مەردومگەل هەمووومان )) و((ئێوە ، هێزێکی ئەبەدیەت ـ)) ، بەم شێوەیە ڕستەکە بەتەواو نەکراوی دەهێڵێتەوە ، هەرچەندە ڕای زۆربەی ڕەخنەگران ئەوەیە ناکرێت ڕستەکەی بەم ناتەواویە هێشتبێتەوە .

سەرچاوە :

ارنولد کیتل ـ مدخل الی الروایه الا نگلیزیه ـ ترجمه / هانی الراهب

# جۆرج ئیلیوت ــ شکسپیری ژن

مەلیکە ڤیکتۆریا* لەدەفتەری یادەوەری رۆژانەیدا لەسەر کاریگەری خوێندنەوەی رۆمانی (ئادەم بیدی) نووسیویەتی " سەرنجێکی قوڵی لەناخمدا بەجێهێشت " مەلیکە ڤیکتۆریا لەسەردەمی خۆیدا ، هەربەم رێزلێنانەوە نەوەستا نامەیەکی بۆ مامی نووسی کە پادشای بەلجیکا بوو (لیوپۆڵد) دەڵێت : ئەگەر تۆ تائیستا (ئادەم بیدی )ت نەخوێندووەتەوە کە رۆمانێکی (جۆرج ئیلیوت) ە داوات لێدەکەم کە بخوێنیتەوە ، لەهاوشێوەی ئەوە دەمێکە نەنووسراوە . هەروەها لەنامەیەکی تریدا مەلیکە ڤیکتۆریا کە بۆ کچەکەی ناردبوو دەڵێت (باوکت دڵخۆش بوو دڵخۆشییەکی زۆر بەخوێندنەوەی رۆمانەکە منیش بۆجاری دووەمە کە دەیخوێنمەوە ، رۆمانەکە قوڵە لە هەستکردنی ناخی خەڵك وراستی کەسایەتیەکاندا) . ئەم مەلیکە دەسەڵاتێکی گەورەی بەسەر وڵاتەکەیدا هەبوو ، لەبواری سیاسی وهونەری وفیکری وئەخلاقیدا(١) خۆی تاکە کەس نەبوو کە لە سەدەی نۆزدەدا بەئەدەبی ئیلیوت سەرسام بێت ، هەروەها دان بنێ بەوەی (مەزنترین ژنە لەمێژووی ئەدەبی ئینگلیزدا) هاورێیەکی تری سەردەمەکەی کە فەیلە سوفی بەناوبانگی ئینگلیز(هێربێرت سبنسەر)ە سەبارەت بەجۆرج ئیلیوت دەڵێت : (مەزنترین ژنە کە بەسەر زەویدا رۆیشت ، ئەو شکسپیرێکە لە رەنگەی مێینەدا) . جۆرج ئیلیوت کە خاوەنی چەندین کۆمەڵە چیرۆکی وەك (اطفال " روث :!!**)و(مشکلە فی البیت***)و(مدلارچ)ە و هەروەها گەورەترین پرۆژەی وەرگێرانی لەسەر دەمەکەی خۆیدا ئەنجامداوە ، ئەویش وەرگێرانی (ژیانی مەسیح) ە لە ئەڵمانیاوە کە کارێکی گەورەو گران بوو ، لەهەزارو پێنجسەد لاپەرە پێکهاتبوو ئیشێکی ئاڵۆزبوو بەڵام باشترین راهێنان بوو بۆ نووسین بەنەفەسێکی درێژ، ئەو تیشکی سەر سورمان وسەرکەتنە خێراکان بوو لەهەموو روویەکەوە ناوی تەواوی جۆرج ئیلیوت لەبنەرەتدا (ماری ئان)ە یا ماریان ئیڤانزە

، له(٢٢ی تشرینی دووەمی ١٨١٩)لەخێزانێك لەدایكبووه كه له ناوەڕاستی ئینگلتەرەدا نیشتەجێ بوون ، كاتێك تەمەنی ماریان پێنج ساڵان بوو گواستیانەوه بۆ( كوفنتری) . لەبارەی شوێن وسروشتەوه ، جۆرج ئیلیوت وتویەتی (ژیانی مرۆڤایەتی پێویستی بەزەویەكه كه ڕەگی بیرەوەرییەكانی تیادا دابكوتێ ولەگەڵ شوێنەكەدا گرێچنی بكات)[٢] . جۆرج خوشەویستی یەكەمیی بۆ زەوی بووه ، ئەم خەزێنەهێنییەی مایەوه لە تونێژاڵی ناخیدا هەڵیدەگرت تا بواری بۆ دەرەخسا ، شارەزایی لەزمانه زیندووەكانی وەك ( ئیتالی ئەڵمانی ،لاتینی ،فەرەنسیشدا) هەبووه . جۆرج ئیلیوت سەبارەت بەوزەی داهێنان وفیكری ژن دەڵێت : ( هەوڵ دەدەم ، بەڵام دەستە وسانم بۆ دركاندنی واتایەك كەلە وزەی پیاوێكی فەیلە سوفدا هەیێت بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا تۆ ناچاریت بەرگەی ژیانی كۆیلایەتی ژن بگریت ) هەرسەبارەت بەهەوڵ وتوانای ژن دەڵێت : (ئەگەر ژنان ئەستێرەیەكی پرشنگدارنەبن لەئاسمانی خۆشبەختیدا ، لانی كەم مۆمێكی داگیرساون لەماڵەكیانیدا) . ئەو قۆناغە ئەدەبیەی كه بەریتانیا لەڕووی سیاسیەوه سەردەمی حوكمڕانی ڤیكتۆری بووه[١] ، لەڕووی هونەری و ئەدەبیەوه قۆناغی كلاسیكی نوێ بوود واته ئەوكاته بووه كه ڕمانسییەت لەسەر هەڵدانادایەو هونەری ئەنداز[illegible]ییش هێشتا ون نەبووه . لەنووسینیكی ناسكدا سەبارەت بە گۆڕانكاریە ئەدەبییەكان دەڵێت : (گۆڕانكارییەكان ئامادەگی باشیان تیدایه بۆ یەكخستنی جیاوازییەكان) ئەم كاره وا ملیدەكات كەئامرازێكی گونجاو هەڵبژێرم بۆ ئەوەی كه پێی بنووسم وببێته پێناسی ناسینەوەی كاره ئەدەبییەكانم ، واته لەناو ئایدۆلۆژیەتی كۆتاییەكانی سەردەمی ڤیكتۆریدا ئەم ڕستەیەی وتووه زۆر یێك لەو نووسەرانەی لەسەردەمی ڤیكتۆریدا نووسیویانه پابەندبوون بەهۆشیاری كەسیتی خۆیانەوه، لەوانه : جۆرج ئیلوت وجۆزیف كۆنراد.(٣)لەڕووی ناوەڕۆكەوه چیرۆكەكانی ئیلیوت زیاتر گوزارشت ئامێزی سروشتن ، بەشێوەیەكی فراوان وگەشەپێدەر لەشوێنێكی دەرەكی سروشتیدا وێنەی كێشاوه . لەلایەكی تریشەوه لەناخدا بناغه شوێنێكی سایكۆلۆژی ناوەكی بوون ، هەردوو ئەم شوێنه كه جورج ئیلیوت پێوەی

پابەندبووە، بەرووی یەکدا کراوە بوون ولە بینینی زهنی خوێنەردا چوونەتەوەناو یەکتر ، چونکە بەتەنها گێڕانەوەی چیرۆکەکان و شوێنکەوتەی دەرەوە نین ، بەلکو دەگەڕێتەوە بۆ کەنزی هۆشیاریی ناوەوەی مرۆڤ ، شوێنی هەر پەرەگرافێك رێگا خۆشکەرە بۆ شوێنێکی تر . جموجوڵێکی بەبەککەیشتووهەیەلەنێوان دیوارو دەرگاکانیدا واتلێدەکات لەجموجۆڵێکی سایکۆلۆژیدا بۆ شایەك پێکدێنێت پێی دەوترێت : (هەلگەڕانەوەی سۆزوپاڵنەرو هەڵچوونی بەکۆل) . جۆرج ئیلیوت خستنە رووی بابەتەکەی دەگوێزێتەوە بێ ئەوەی دوودڵ بێت لەوەی کامە دەرەکییەو کامە ناوەکییە ، ئەو جۆرە نووسینە وەك باکگراوندێکی پتەو وایلێکرد بەرەو نووسینی رۆمان هەنگاوبێت .لەسەردەمی خۆیدا ، نووسینەکانی زیاتر لە گۆڤاری (وستمنستر) دا بلاو دەکردەوە کە گۆڤارێکی هەلبژاردەی ئەدەبی و فیکری بوو ، هەر لەم رێگەیەوە توانی هاوڕێیەکی فەیلەسوفی وەك (هربرت سبنسر) بنا سێت و هەر لەو قۆناغەدا پەیامنێری لەندەنی (جورج هنری لویس)ی ناسی وبەتەواوی تێکەل بەژیانی بوو ، دواتردەبێتە هاوسەری ولەگەلیدا دەژی وئەمە ڕێڕەوی ژیانی داهێنانی دەگۆڕێت ، هەر لەم قۆناغەی ژیانیدا بوو ناوی خواستراوی (جورج ئیلیوت)ی بۆ خۆی هەلبژاردولە یەکەم رۆمانی (ئادەم بیدی) دا دەردەکەویت . لەسالی (١٨٥٩) دا پێش ئەوە کچێکی پێگەیشتوونەبوو ، لەتەمەنی (٤٠) چل سالیدا ئەزموونی سالە کانی پڕبوونەوەو زانیاری و خوێندنەوەکانی وایکرد لەم کارەدا دەربکەوێت . (ئادەم بیدی) سەرنجی زۆر بەی گەورە نووسەرانی راکێشا وەك (زاکیری ودیکنیز) ، ئەو یەکەم کەس بوو وەك ژنێکی نووسەر دانی پێدابنرێت سەرباری ئەوەی کە ئیلیوت نەیویستووە ئێکەلاوی ژنانی ئەرستۆکرات بێت ، بەهۆی ئەو بارودۆخە خێزانیەی تێیدا ژیاوە لە کۆمەل دابراوە.

لەگێرانەوەی چیرۆکەکانیدا هێرشێکی فێلبازانە ناکات ، لەزۆر جێگای جیاوازدا لە چیرۆکەکانیدا گێڕەرەوەیە، واتە رۆماننووس کەسێکیتر نییە ئامادەبوونێکی ئازادە لە جەستەدا ، لەگەل ئەوەشدا بەرهەلیی لەجێگەیەکەوە بۆ دیمەنێکی درامیتر دەجولێت ، هێزێکی وای دەداتێ کە خوێنەر بەئاسانی دەتوانرێت ئەودیوی ئەوپەردە شەفافیتە

ببینێت که دادراوه تەوه . هەڵسەنگاندنی ئەخلاقی ئاوێتەیە لەگەڵ وەسفکردندا بەئازادی ،
لەگەل هەموو ئەمانەشدا بیروبۆچوونێکی شاراوە بە ئاشکرا وەك دیمەنە سروشتیەکان
دەبینێت ، گوێت لە سەدایەکی بێدەنگی پەنگخواردووە دەبێت . جورج ئیلیوت دەستەخاتە
سەر شتە نایابەکان وکێشە نموونەییەکان ، لەشێوەی رۆمانووسدا ئاستە نگەکان بەپشتبە
ستن بەپێشینەی خۆی دەکاتە بنچینەی دارێژراو . لەگەڵ ئەو دابرانە کۆمەڵایەتییەدا ،
بەشداری زۆربەی کۆڕە ئەدەبی و رۆشنبیرییەکانی کردووەو پەیوەندی پتەوی لەگەڵ زۆر بەی
نووسەرو فەیلەسوفانی سەردەمەکەی خۆیدا هەبووە وەك( سپنسر ، شاعیررۆبەرت براونگ
مۆسیقار فرانز لیست ، تنیسون ترگنیف ودیکنز ) ولەرێگەی نامە گۆڕینەوەشەوە لەگەڵ
زۆر کەسێتردا . هەروەها پێشەنگ وکەسایەتی بەناوبانگ ونووسەر (هاریێت بیچەر —ستو )
هەروەها لەگەڵ (ستیوارت ) یش بۆماوەی هەشت ساڵ نامەیان گۆڕیوەتەوە کە
ناونیشانی (ئازاکەم) یان ( پەرستگاکەم) ی بەسەردا دابڕیوە ، پەیوەندیشی بەژنانی
ئاساییەوە هەبووە . درکیان بەو کردووەکەئەم ژنە نووسەرە بەتەنها خەمی ئەوان ئاشکرا
دەکات ، هەروەها قوتابیەکی (سپنسر ) کە فەیلە سوفێکی ئەمەریکی بوو ناوی (فیسك)
بوو لەنامەیەکیدا کە بۆژنەکەی نووسیبوو وەسفی جۆرج ئیلیوت دەکات و زۆر لایەنی
ئاشکرا دەکات و دەڵێت :" ئاشکرانیە جوانییەکی ئاسایی هەیە ، [illegible] نەکانی
ئەموەڕاوی وناشیرین دەردەکەوێت لەسەر بلاوکراوەکان لەگەڵ ئەوەی زۆر رووخساری
خۆشەویستترە لە(جۆرج ساند)". بێگومان ئەمە پەیوەندی بەرووخساری جوانیەوە نییە ،
هەست ناکەیت کەئەمە لەتەمەنی پەنجاودووساڵیدایە، چرچەکانی دەموچاوی گونجاون ،
لوتێکی ئاسایی ودووچاوی شینی گوزارشتکەر دەمێکی گەورە بەلام لەگەڵ ئەوەشدا کە
قسە دەکات سەرنجڕاکێشە . پرچەکانی تارمایین وبەپارچەیەك دانتێل داپۆشیوە ، هەمیشە
وادەردەکەوێت سادەو ساکارە ، ڕاشکاوانە دەدوێت ، بەرێزو نەرم ونیانە ، زۆر شانازی
بەمێردەکەیەوە دەکات ، خۆشەویستیەکەی بۆ ئەوە ، بڕیاردەدەم کە هیچ کەسێکیترم نەدیوە
لەژیانمدا وەکو ئەو پیاوانە ڕەفتار ناکات بەلکو زۆر ژنانە رەفتاردەکات ، بەرووخسارو

بەرەفتاریش کەهەر دەڵێی بۆ منداڵ لەباوەش گرتن دروستبووە ، لەگەڵ ئەوەشدا توانایەکی لە رادەبەدەری هەیە کاتێك دەکەوێتە گفتوگۆی فیکرییەوە زیرەکترین پیاوە لە گفتوگۆدا ،لە گەڵیدا هاوتا نابێت ، چی ؟ دەڵێم زیرەکترین پیاو.لەژیانمدا من کەسێکم نەناسی پیاوێك کە بووەستێت لەرووبەڕووی بتوانێت گفتوگۆی لەگەڵدا بکات لە (هربرت سبنسر) زیاتر[٥]. ئەمە نموونەیەکە لەبارەی فەیلەسوفەکانی سەردەمەکەی جورج ئیلیوت کە ناسیویانە ، سەبارەت بەرای نووسەران ورۆماننووسەکان لە یەکێك لەئاهەنگەکاندا (جۆرج هنری لویس ) دەڵێت :"باهەموویێکی ترگنیف نۆش بکەین کەگەورەترین رۆماننوسە لەم سەردەمەماندا" ترگنیف وەڵام دەداتەوە دەڵێت :" من بەپلەی دووەم وسێیەم دێم لەدوای دیکنز و جۆرج ئیلیوت وجۆرج ساند" لەو کاتەشدا تەنها ئیلیوت لەژیاندا مابوو . دیکنز زاکیری لە سەرەتای کارەکانیدا یەکەمین کەس بوون کە دانیان بەکارەکانی ئیلیوتداناو دەڵێت :" نووسەرێکی شارەزاو بەتوانایەو دەرکەوتووە لەو جوددا، بێگومان ئەم لەقۆناغی یەکەمدابۆ ئەوە هەوڵ و کۆششی نەدەکرد تا نووسەران و رەخنە گران رێزی لێبنێن بەڵکو کارەکان خۆیان سەنگی دادوەرانە بوون ." سەبارەت بەتەوژمی هۆشیاریی دەروونی یەکێك بوو لەو کەسانەی پێش فرۆید پەی بە (شیکاری دەروونی) ی بردووە ، هۆشیارییەکەی ئاوێتەی ئەقڵ و دڵ بووە ، چیرۆکەکانی پەیامێك بوون بۆ ژیان ، کەسایەتیەکانی راستەقینەو واقعی بوون لەچوار چێوەی نەفسانەدا چوتە دەرەوە بەکورتی ئیلیوت خۆی دۆزیبووەوە بەوەی کە جیهانێکی رۆماننوسینی تایبەت بەخۆی هەیێت ، لێرەدا گرنگ ئەوەیە وێنە یەکی زیندووی بەجێهێشت لەسەر شوێنەواری مردنی ، بەڵام گرنگیدان بەکارەکانی دەگەڕێتەوە بۆ ئەو دەرەوشانەوەیەی کە لەسەر دەستی رەخنە گرانی هاوچەرخی دەنووسران . یەکێك لەنووسەرەکان دەڵێت :" مێژووی رۆمانەکانی ئیلیوت بەندە بە مێژووی ژیانی خۆی وجۆرج لویسەوە" بەڵێ ئەوەراستە ، چونکە لەگەڵ ئەودا داهێنانەکانی سەربەهەڵداو بەمردنی لویس داهێنانەکانی جورج ئیلیوت -یش وەستان ، کاتێ لویس -ی هاوسەری لەساڵی (١٨٧٨زاینی )کۆچی دوایی کرد بەهۆی

نەخۆشییەکی کەم خایەن ئامادەی مەراسیمی ناشتنەکەی نەبوو، دەرگاو پەنجەرەکان داخران ، بەتەنها کارەکەرەکەی قووڵی ئازارەکانی ئەمی دەزانی ، ئەو گوێی لەهاوارەکانی بوو کەدەنگی دەدایەوە لەناو هەموو کونجێکیماڵەکەدا، هەموو چاوپێکەوتنێکی ڕەت دەکردەوەو یەك مانگی تەواو رووناکی ڕۆژی نەبینی . دوای چەند مانگێك جارێکیتر دەگەڕێتەوەشێوەی ئاسایی خۆی ، ئەمجارەیان ئەقڵ زاڵ دەبێت بەسەر سۆزیداو دەڵێت :" مردووەکان ، بەردەوامبوون بە زیندووەکان دەبەخشن بۆ کارکردنەسەر هۆشی ئەوانیتر "[2]

دوای دوومانگ لەمردنی (لویس) گەڕایەوە بۆ خوێندنەوەی یادگارییەکانی وئامادەی کردن بۆ چاپ ، بەڵام هەربەوشێوەیە مایەوە پێشوازی لە هیچ هاوڕێیەکی نەکرد . تەنانەت (سبنسر)یش بەخت یاوەری نەبوو بۆ ئەو پێشوازییە ، ئەوەی وەك هاوڕێیەکی نموونەیی ئامادەی یارمەتیدانی بوو(لویس) بوو، هەربەوشێوەیە بەدابڕاوی مایەوە تا ئەوکاتەی (جۆن ڤالتەر کرۆس) ئەو بۆشاییە سۆزدارییەی بۆ پڕ دەکاتەوە ، تارادەیەکی بێسنوور خۆشیدەوێت . هەر چەندە هەشت ساڵ لەویش مندالترە ، ئازارو برینە کانی کەم دەکاتەوە هەر بۆیە ش لە(٦ی ئایاری١٨٨٠) بڕیار دەدات شوویە(کرۆس) ی هاوڕێ کۆنەکەی بکات ئەمجارەشیان لە مردنێکی کتوپڕدا (جورج ئیلیوت) نەخۆشییەك جەستەی دەکوژێت ، دوای چەند مانگێك لە گەڕانەوەی خوی هەرگیز نەیدەزانی لەکاتی نووسیندا مردنێکی کتوپڕ ڕووبەڕووی دەبێتەوە(٢) سەبارەت بەگەورەیی ئیلیوت لەلای خەلك و لەچاوی مێردەکەیدا ،لەو چەند دێرەدا دەردەکەوێت کە(جۆن ڤالتەر کرۆس) لەسەر گۆڕکەی بەم شێوەیەی دەنووسێت : ( لێرەدا پێتێك شکا ، قەڵەمێك کە شادی و نەمریی بۆ ئەقڵ و دڵ هەڵگرت ، لێرەدایە دوانیشانەی بەهارێك کە دەگۆڕا بۆ رووبارێك لە وشەی جوان ، دیاردەکانی وشك بوونەوە ). پیتەکان دەشکێن و پارچەبلوریەکان دەمێننەوە . لەگەڵ خاوەنەکەیدا جەخت دەکەیتە وە کەژیانی مرۆڤ پێویستە لە نیشتمانێکدا ڕەگ لە پارچە زەویەکی تایبەتدا داکوتێت ، هەتا بتوانین یادگارییەکان بگەڕێنینەوە و بە ساتە کانی گەرم ببنەوە .[2]

پەراوێز

* مەلیکە ڤیکتۆریا لە بەریتانیا نزیکەی (٦٤) ساڵ بەو پەڕی هێزو گورەییەوە حوکمرانی کردووە .

** اطفال"روث"!!تاليف/ George Eliott ترجمه /احمد عصام الدين .

*** مشكله في البيت !! تاليف / George Eliott ترجمه /احمد عصام الدين.

سەرچاوە


١. محمود تلوعی ــ ژن لەسەرتەختی دەسەلآت ، و/ ئەبوبەکر مەجیدی

٢. گوردن س.هايت ـ حياة جورج ئيليوت

٣. مايكل.ه. ليفنس-اصول ادب الحداثة ، ترجمة/ يوسف عبدالمسيح ثروة.

٤. ليتيس كوبر- جورج ئيليوت

٥. املى نصرالله .نساء رائدت ٤ .

# میدلمارچ ــ جۆرج ئیلیوت

# ا یما ــ جین ئوستن

رۆمانی( مید لمارچ ) ی جۆرج ئیلیوت رۆمـانێکی بەرفراوانـە ، پانتاییـەکی گـەورەو وەختی لـەڕووی دووربـینی و هەڵوێـستیەوە لـەخۆگرتووە ، بەشـێوەیەك كەناتوانین لـەڕووی پرانسیپەوە جیایی بکەینەوەو بڵێین لەجۆری (ایما) یە ، ئاسۆی گرنگی پێدان زۆر گـەورەترە ، ئەو گرنگیەش لەو مەسەلەیەوە دەبێت کەپەیوەندییەکی جۆری بە هونەرو ژیانەوە هەیـە ، زانستی ژیـان تێیـدا بـەرەو پێـشەوە دەچـێت بەرهـەمێکی ڕەشنوسـی ڕیفۆرمانـە ی کۆمەڵایەتییە بۆسا ڵی (١٨٣٢) ، کێشەی کـاری دەسـت بـڕین ودەروونزانـی و خۆبـەخت کردن ئەو کێشانەی کەناتوانین بەراوردی بکەین بەو کێشانەی کەجین ئۆستن گرنگی پێـداوە ، لەگەڵ ئەو جەستەپتەوو ئاستە بەرزەشدا کەهەیبووە چەندایەتی ئەو گرنگی پێدانە ئاشکرا نیە لە بەرامبەر هونەری نـوێی چیرۆك نوسـیندان ، جـۆرج ئیلیـوت بابـەتی کێـشەکانی فراوانترن بەڵام لەبنەڕەتدا نایگۆڕێت .

دنیای میـدلمارچ گەورەترو چەندایەتی ترە بەڵام لـە( ایمـا ) دا جـین ئۆسـتن فەزایـەك بـۆ کێشەکان دەکاتەوە بەشێوازی جیاواز جیاواز دەتوانین وای وەسـف بکـەین کـە خـۆی لاداوە لەکێشەکان ، (میـدلمارچ ) لەگەڵ ئـەو لایەنانـەی کەهـەڵیگرتووە لـەڕووی هێـزو شـانازی کردنـەوەزیاتردەتوانین بـەراوردی بکـەین بەرۆمانـەکانی تۆلـستۆی بەومانایـە نـا کەتـەواو شۆڕشگێڕین .

بەبەراورد کردن لەگەڵ جین ئۆستن شـایەنی زیاترشـرۆڤە کـردن وپـشکنینە ، لەبەنـدی یەکەمی ڕۆمانەکەدا بەئاشکرا گرنگی نووسـەر سـەبارەت بـەراو بۆچـونی کەسـایەتیەکانی دەردەکەون ئەو گرنگیە لەلای( جین ئۆسـتن ) هەیـە لەوێـدا شـتێك نیـە تەنانـەت لـەڕووی شێوازیشەوە لەیەکتریان جیا بکاتەوە ، ئەو وەسفە نمونەییەی لە(ایما)دا هەیـە هـەمان کـات

وشوێن ئامادەیە ، لەرۆڵی خۆیدا ئەو باس لەو کێشانە دەکات وبنیاتی کۆمەڵگایەك دەنێتەوە لەسەر ڕژێمی ئەخلاقی پێگەیشتوی هۆشیار ، باوەڕی بەهاوبەشی کردنی هەموان هەیە لەژیانی کۆمەڵگایەکی دیاری کراودا ، بەڵام ئەم ڕستەیە ئاماژە کردنە بۆگۆڕان : (( لەگەڵ ئەوەی زۆرترین هۆشەکان کرانەوەو ڕێك وپێکیان لەدەست داوە دەچنەوە باوەشی ڕەگێکی توندو تۆڵ کەناوەوەی نەریت وکەلتورە ، ئەوی دەشیەوێت بۆخۆی ببێتە پێکهاتەیەکی تر لەگرنگی دا هەر سوورە لەسەر پارێزگاری کردن لەو قوتوەی بەئاگاییەوە هەڵدەگیرێت سەیری دەکەن وگومانی لێدەکەن چاوچنۆکەکان دەست بگرن بەسەریدا ))

ڕەنگە ڕستەکە لێرەدا هەمووی قورساییەکی هەبێت ڕەنگە لاوازیش بێت ، یەکانگیر دەبێتەوە لەگەڵ داب ونەریتە عەقڵانییەکان ، جۆرج ئیلیوت جیاوازیەکی تەواوی هەیە لەگەڵ ڕۆمانو.سەکانی پێش خۆی ، ئەوان بۆچوونیان بۆبابەتێکی دیاری کراوە یاناڕەزوی زاڵییان هەیە بو..ونکردنەوەی زیاتر لەوەی کەپێویستە لەرێگەی گشتاندنی ئەخلاقییەوە ، لەسەرەتادا وەسفێکی سەرپێیانە دەخوێنینەوە ، ڕەخنەگرانەلەرووی ئەخلاقییەوە ، کەکسایەتی بەرێز (بروك) تێیدا چالاکانە بەرەو پێشەوە دەچێت بۆچونمان سەبارەت بەو وورده وورده زەق دەکاتەوە ، بەڵام هەر بەو دوورییەوە ڕاستەو خۆ تێپەڕینمان دەباتەوە بۆ حاڵەتێکی تر کەبەرێز (بروك) ی تێدایە ، ((هەرکەسێك بیەوێت بچێتەناخییەوە )) خوێندنەوەی سەرپێییانەی خۆی هەیە بۆی .

یەکێك لەتواناکانی جۆرج ئیلیوت شێوازی نووسینییەتی وەك ڕۆمانووسێك بەبەردەوام چیرۆکەکانی پەیوەست کردوتەوە بە ژیانمانەوە ، بۆئەوەی خۆمان وون نەکەین لەدنیای ڕۆمانەوەهەمیەکاندا ، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو هاوکێشەیە ڕاست دەکاتەوە کەدەچێتەوە سەربابەتی( جین ئۆستن).

جۆرج ئیلیوت دادەنرێت بەوەی نووسەرێکی بەهێزە وپشت ئەستوورە بەخۆی بەڵام لەبنەڕەتدا کەسێکی ناجێگیرە ، پاکییەکەی وایلێکردووەهەمیشە ئاسوی ئەخلاقی تەسك بێت بارودۆخی جۆرج ئیلیوت زۆر قوڵترو جیاوازترە لەبارو دۆخی (جین ئۆستن) واتە

هۆشیاری (جۆرج ئیلیوت) لەهۆشیاری (جین ئۆستن) کاملتره ، هەندێ ووشەو بابەت ودەستەواژە هەیە ( جین ئۆستن ) نەیتوانیوە دەریببڕێت لە((ایما))دا لەوانەکێشەکانی جیهانی گەورە ، لەجیهانێکی فراوانتردا کەزانیاری لەخۆدەگرێت دەخاتەروو مۆدێرنەتی جۆرج ئیلیوت لەوەدایە هەرگیز بەڕوکەشیش خۆی بەزل نازانێت شانازیش بەزانیارییەکانی خۆیەوە ناکات ، ڕێگەی بەرەخنە داوە کەبەهێز ترو فراوانتری بکات لەسەرینەمای ئەو ووتەیە دەڕوا کەدەڵێت " گێلیەکی سەربەخۆ " لەگەڵئەوە شدا ئاگای لەهەمووچینەکانی کۆمەڵ بوو ، بەهۆی ئەوەی کەکەسێکی زیرەك بووە ئاگای لەهەموو لایەنەکان بووە بە شێوەیەکی بەرفراوان .

هەرلەبرگەی پێشووی ئەم چیرۆکەدا رێکەوتی ڕستەیەك دەکەین پڕە لەسەر زەنشت کردن ئەویش ئەو ڕستەیەیە کەدەڵێت """ پرسیار بکەن لەهەرژنێك " لێرەدا بازدانێك بەویژدانی نووسەرەوە دیارە بەو شێوەیەش ئازار بەخش نیە بەڵام یەکنایەتەوە لەگەڵ لایەنی هونەری وستاتیکی دا ، وەسفی جوانی لێرەدا لاوازە ، گاڵتە جارییەك لەخۆ دەگرێت و بۆشاییەك لەچیرۆکەکەدا پردەکاتەوە کەئەمە لەئاست ئەوسیفەتانەدا نیە کەلەوەو پێش بەکاری هێناون یاله دەستەواژەی " هەموو زیندەوەرێك شکۆمەندی ئەوەی هەیە لەگەڵیدا بژین " ووشەی (شکۆ مەندی) بەچ واتایەك بەکار هاتووە ئەمەنادیارە ، ئەم گاڵتەجارییە دژی کێیە ؟ ئەم ڕستەیە بۆخوێنەر بازدانە بەسەر ووردبونەوە لەئەخلاقیاتی (جۆرج ئیلیوت ) ، ویژدانی کەسایەتی دەشارێتەوە ، ئایا دەتوانین لەلاوازی بابەتەکە ی دابیبڕین .

وەسفێکی ترلە(میدلارچ) ئەودیمەنەی کەدۆرسی پیشان دەدات لەئاپارتمانەکەیدا لەدوای شەش مانگ لەشوکردنی دەگری ، دەتوانین ڕۆما بەجیهانێکی ڕۆحی دابنێین بۆشرۆڤە کردنی ئەودیمەنە لەڕوانگەی ئەوکەسانەشی کەبەهۆی هێزی زانستیانەوە دەرکەوتن ڕووحێکی نارامیان هەبووبەیەکێتی سەرکێشیەکانیان گۆڕانکاریان کرد لەبارودۆخە مێژوویەکاندابەڵام هەندێکی تر بەشێوەیەکی تر ڕووبەڕوی مێژووبوونەتەوە ، شتێکی گەورەو تێکشکاویان ئاشکرا کردووە لەشاری بنەماڵەی ئیمپراتۆریەتەکاندا شتی گەورەیان

لەنێو بیروەری ئەو کچانەدا تەقاندوتەوە کەلەئینگلتەرا لەژێرکاریگەری مەزهەبی (البیوریتانی)سویسریدا بوون (١) .

جۆرج ئیلیوت لەم ڕۆماندادوك ڕۆمانوسێکی گەورە دەردەکەوێت کاتێك وەسفی بابەتێکی گەورە دەکات لەڕێگەی وەسفکردن وشیکردنەوەی سوزی کەسێکی هەست ناسکەوە وەکو ئەو هەست وسۆزەی کە(دۆرسی)هەیەتی بەشێوەیەکی گشتی سوزێکی نەگۆڕو چەسپاوەلەبەرامبەر خۆشەویستەکەی وەکو خۆشەویستی سەردەمی ڕۆمەکان ،

جۆرج ئیلیوت دەمانباتەوە نێودیمەنی مەشهەدێکی ڕۆمانی نەك بەتەنهالەڕوانگەی دەربڕینی خۆشەویستی کەسێکەوە ، بەلکو بەچونەنێو مێژوویەکی بەبیرو باوەڕ ، هەروەها لەبەیەکدا چونی هەردوومەزهەبی کاسۆلیکی وپروتستانتی وەسنی وپاکیزەیی ، یەکەمیان وێنەیەکی بابەتیمان پێدەخاتەوە ، دووەمیشیان پلەپلە سەردەکەوێت بەرەو ڕوناکی ئەوبیرو باوەڕەی کە(دۆرسی )تێدا دەژی ، لەگەڵئەوەشدانامانگەیەنێتە هەست و سۆزێك کەلەم کاتەدا تێیدا دەژی ، جۆرج ئیلیوت خۆی توانای هەیە بەسەر بەخشینی خۆشبەختی یاناززاری زیاتری شتەکان بەشێوەیەکی دامالڕاو دەرگای هیواکان دەکاتەوە بۆئەو بارو دۆخە تایبەتیەی کەکەسێك تێیدا دەژی .

بەمەدا دەردەکەوێت ڕۆمانی (میدلارچ) کەمتر سیمبولیە لە)(ایما)ی جین ئۆستن ، واتە ئەو ئیش دەکات لەسەرهۆش وتێگەیشتنی ئێمە لەڕێگەی پێشکەش کردنی کسایەتی واقعی وهەمەلایەنە لەبارودۆخێکی کۆمەڵایەتی واقعی بەهێزو دامەزراو .

جۆرج ئیلیوت هەوڵی زۆردەدات بۆوێنەکردنی باگراوندەکان ، دەتوانین پرسیار بکەین ئەو بارودۆخە هەرێم گیرییە کەئەوخوێنەنەوەی ژیانی بۆدەکات ؟ لەڕێگەی ئەم ڕۆمانەوە دەرکەوتووەکوتایی سەردەمی ڕۆژانی (قە دیسە تیریزا)یەئەو ڕۆژانەی ((پشکۆ لەناخیاندا دەیخواردن وشانازیبیان بەوڕازیبونە بێ سنورەوە دەکردکەشوێنی کەوتبوون ، مەبەست لێرەدا ئەو ماندوێتییە بووکەبەهیچ پێوەر نەدەکرا بۆئەوەی نائومێدی ناخیان چاکساز بکەن لەگەڵ هۆشمەندیاندا مەستن بەژیانێك کەناخەکان تێدەپەرێنێت )). (١)

لێرەدا نووسەر بەتیشکێك سەرنجمان رادەکێشێت بۆتەو کێشانەی ژنە قەدیسە نوێیەکان هەیانە ئەویش هەژار کردنیانە بەمە بەستی " پشت بەستن بەبیرو باوەری کۆمەڵایەتی تۆکمەورێك پێکردن ئەوەی کەدەتوانین پێی هەستین وبەوەزیفەی زانستی دەزانین ئەوەیە کەرۆحە ئارەزوومەندەکان پێکەوە گرێ بدات " ئەمەیە والە(دۆرسی بروك )دەکات بەبێ دوودڵی بیرلە( پاکیزەیی مویارك ) بکاتەوە لەرستەی دووەمی بەندی یەکەمدا هەتا دەرکەوتنی لیدگیت ، لێرەوە بابەتەکە پێشکەوتنێك بەخۆوە دەبینێت ، دۆرسی لەگەڵ ئەو شوێنی کەسایەتیەی کەهەیەتی ، ئەو وێنەیەیە کەشێوەیەکی بەرزو جوانە هەرچەندە لەرووی جەستەییەوە هێشتا پێنەگەیشتووەتەوقی ژیانێکی پەیوەست لەمەلیدایە بەڵام لەرووی هۆش و بۆچونەکانی و سووربوون لەسەر راکانی ئەو کەسایەتییەی بۆدروست بووە .

ئەو جیهانەی کە دورسی کازبون لە(مدلارچ)تێدا دەژین و هەموو کەسایەتیەکانی تری نێو ئەم رۆمانە بەلێهاتوی دانراون ،

جۆرج ئیلیوت دەزانێت غەمەکان چۆن غەمەکان دەگوێزێتەوە ؟ ناتوانین ئەوەی کەلەم رۆماندا هەستی پێدەکەین لەکۆمەڵ و کێشەکانی دابیبرین .(١)

جۆرج ئیلیوت دوورۆمانی لە(میدلارچ)دا کۆکردۆتەوە و بەدووقوتاغی جیاوازدا دەروات ، چیرۆکی (خاتووبروك) و چیرۆکی

(لیدگیت) ، لەراستیداهیچ قەدەرێکی چاوەروانەنەکراوسەرهەڵنادا لە(میدلارچ) دا بەپێچەوانەوە ، جۆرج ئیلیوت بەدرێژایی رۆمانەکە پێدادەگرێت لەسەر هەموو تەنگەژە ئەخلاقییەکان و هەموو بڕیارێکی پێویست ، بنچینەی هێزێکی ئەخلاقی بوتوسینی بەکاردێنێت ، کەسایەتیەکانیش نەسەپێنراوە بەسەریاندا کەدەبێت بەکەسێکی تایبەت بگەن لەگەڵ ئەو فشارە گەورەیەی کەهەیە لەشێوازی سەختی ژیاندا لە(میدلارچ)دا .

جۆرج ئیلیوت لەم رۆماندا تەواو شێوازی خۆی گۆڕیوە ، بەڵام تاچەند سەرکەوتووە لەم شێوازی نووسینە ئەوە دەبێت باس لەو پەیوەندییە تاکانە بکەین کەلەناو چیرۆکەکەدا

هەیەو هەریەکەیان لەوی تریان نمونەیەکی جیاوازە ، (د . لیفیس) لە برگەیەکی جواندا سەبارەت بەجۆرج ئیلیوت لەنوسینێکیدا لە( کەلەپوری گەورەدا) دەڵێت : هەوڵی داوەلەگەڵ گۆرانکارییەکانی کۆمەڵ وفرمایشتە گشتییەکان (( هیچ ژیانێکی تایبەت نابینین کەژیانە گشتییە فراوانەکە بریاری لەسەر نەدابێت )) تامانج لێرەدا شاراوەیە ئەو تێبینیانەی کەلەسەر(میدلارچ) بەدەست هاتووە ، بەشێوەیەکی سەرنج راکێش ئەو رۆماننوسە ئەوەی بەرجەستەی کردووە لەشیکارییەکی قوڵ وناوازەدا بلیمەتی(جۆرج ئیلیوت) دەردەخات .

میدلارچ ـ کتێبێکی جوانی دەوڵەمەندو زیرەکانەیە ، دەوڵەمەندە لەرووی ناوەروك وکەشف کردنی کەسایەتیەکان بەپراکتیکی چەسپاوەلەرووی بارودۆخی کۆمەڵایەتی بەئاستێکی رێژەیی ناهاوتاییەك هەیە لەنێوان سەرکەوتنی بەشێك وپاشەکشە کردن لەبەشێکی تریدا ، جۆرێك لەو رێگا داخراوە شەیتانیەی کە(لیدگیت و رۆزاموند)دەیگرنە بەر بوئەوەی بەیەك بگەن ، لێرەدا بەشێوەیەکی رەها تەوق شکاندن هەیە ، لاوازییەکی تر ئەوەیە لەو جۆرە پیاوە بگەی کەلەتوانایدایە پێهەوایی( دۆرسی)لەرۆما بروەێنێتەوە .

هەروەها خاتوو (بولسترد )ژنێکی نەریتخوازە ودواکەوتووە زیاتر لەبوکێکی یاریکردن دەچێت ، پایەی کەنیسەو بورجواز یەتی مدلارچ وایلێدەکات کەزۆر بەناشیرینی رابردووی مێردەرەشپێستەکەی باسبکات ، لەگەڵئەوەی ئەم ژنەخوێنەدەواری کەمە ، رۆحێکی بەوەفای هەیە لەناخی خۆیدا ، نایەوێت خۆشەویستی خۆی بۆ پیاوەکەی دەربرێت کەبەدرێژایی نیوەی تەمەنیان بەیەکەوە بوون ، لەدواجاردانازار دەکێشێ و دەرگا لەخۆی دادەخات ، دەزانێت کەدەتوانێت دەرگا بکاتەوەو بچێت بولای مێردە دڵشکاوو غەمبارەکەی وباسی گوناهی خۆی بۆبکات ، بگری و لۆمەی نەکات ، بەڵام ئەمەش پێویستی بەکات هەیە تالەژیانیدامالئاوایی بکات لەخۆبەزل زانین وشانازی کردن بەخۆوە . لەدواجاردا هێز دەداتەبەر خۆی دەروات بۆخوارەوە ، بەچەند جوڵەیەك وورد وورد دەروات کەپرە لەنەفامی دەروات تاپیشانی خەلکی بدات ژیانێکی تازەی دەست پێکردووە پرە

لەئێش و ئازاروخەفەت ، هەمووزێڕو زیوەکانی لادەبات و جلێکی ڕەش لەگەڵ شەبقەیەك ناسك لەبەر دەکات وقژی لەدواوە کۆدەکاتەوە بەشێوەیەك کەلە خۆئامادەکردن بچێت بۆکەنیسە .

جۆرج ئیلیوت ـ زیرەکترین ڕۆمانوسی سەردەمەکەی خۆیەتی ، هەرگیز لەهیچ کێشەیەك ڕاناکات و هەستەمرۆڤانەکەی وبەخشندەیی ولێهاتووی و هزرمەندییەکەی شتێکە لەژیاندا ڕاناکات لێی ، لەهەموو جێگەیەکدا بەکردەیی مامەڵەی لەگەڵدا دەکات ، ئەو هێزەیە کەلەگەڵ وزە هونەرییەکەیدا پاڵی پێوە دەنێت . فەلسەفەی(جۆرج ئیلیوت )ڕەگی ئەو لاوازییەکەتێبینی دەکرێت لەو پرۆگرامەی کێشە کۆمەڵایەتیەکانی پێدەخاتە ڕوو لەرۆمانەکەدا ، لێرەدا مەبەست ئەوەنیە کەخەمی ئەخلاقی دەمێت هەربوونی هەمێت و دەرئەخرێت ، چونکە کاتێك وەسفی کەسایەتیەکان دەکات بۆدورترین جێگا دوریان دەخاتەوە قورسە بتوانیت بەشێوەیەکی گەرم وگوڕ هەست ونەستیان بگوێزێتەوە ، دانانی کەسایەتیەکان لەشێوەیەکی خەیاڵییەوە بونەتەشێوەیەکی بەرجەستە کراو ، هەموو کەسایەتیەکان وبارو دۆخەکانیش لەهزری ئەخلاقی( جۆرج ئیلیوت)ەوە گەشەیان کردووە لەگەڵ ئەو تێبینیانەی بەشێوەیەکی ناڕاستەو خۆدەگاتە ئەنجام.

هەستی مرۆڤانەو لێهاتوی (جۆرج ئیلیوت ) بەتەواوی ڕۆمانەکە ڕۆشن دەکاتەوە بەخاڵە لاوازەکانیشیەوە کەناتوانین هەڵێکی ڕەش بەسەر سۆزی بهێنین لەبەرامبەر فەلسەفەی نوسینیدا ، کەسایەتی ( دۆرسی ) بەتەواوتی بەرهەمی برسێتی ڕۆحی ( جۆرج ئیلیوت)ە لەهەمان کاتدا کەسایەتیەکی نمونەیی لاوازە لەروانگە فەلسەفیەکەوە کەئەمەش لەجۆ جوڵ وقسەکردندا دەردەکەوێت لەڕوی هونەریشەوە لاوازە ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆئەوەی (جۆرج ئیلیوت )لەسەر کەسایەتیەکان و وەسف کردنیان زۆر ڕادەوەستێت کەهەرگیز دانا بڕێت لەناواقعیەتە کۆمەڵایەتیەکان ولەڕووی هونەرییەوە لەخەیاڵی خۆیدا دەیکێشێت و نمونەیەکی وێنە کێشراوە ، جۆرج ئیلیوت ـ لە(مدلارچ)دا

فەلسەفەیەکی ناگفتوگۆی بنیات دەنێت کەکاریگەری گشتی لەسەر لاواز کردنی ئامانجەکەی هەیە و لەگەڵ ئەوەشدا پێش جۆرج ئیلیوت ڕۆمانوسێکی ترنەبووە بەم شێوە هۆشمەندیی وڕاستگۆییە کێشە یەك لەدوایی یەکەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی و سروشتی گۆڕانی تاکەکان وپەیوەندیەکانیان بگوێزێتەوە و بیخاتە ڕوو، نووسەرێکی گەورە بووە مرۆڤ دۆست و بەئەمەك بووە ، ڕای زۆربەی نوسەران ورەخنەگران ئەوەیە کەرمنگە ڕۆماننوسەکانی ئاینندە زیاتر پشتی پێ ببەستن ولەسەری بڕۆن وهۆشیارانە تر ( مدلارچ ) لەهەر ڕۆمانێکی تری ئینگلیزی بخوێننەوە .(١ )

لەساڵی (١٩٠٩) دا فۆرد ووتارێك بڵاو دەکاتەوە بەناونیشانی ((ئاوابونی کەسایەتیە گەورەکان ))ئەمە دەستەواژەیەکە بۆتشیکارکردنی پێشکەوتنە مێژوویەکانی ئەم دواییە کەبەم شێوەیە کورتی دەکاتەوە ، بەڵام (کارلیاڵ وەل نیومان وارنولدوتنسن وجۆرج ئیلیوت )ئەمانە کەسایەتیە گەورانە بوون کەبەنیسبەت (فورد)ەوە ((دواین پێغەمبەرن ))بوون(٢) ، کەلەبەر چاوی ئەودا سەربەخۆییەکی کۆمەڵایەتی وکۆهاوتایەکی ئەخلاقی و ڕۆشنبیری بو[illegible]کاروەکیاندا نمایشی هەموکەسێکیان دەکرد ، لەپاڵ دەرکەوتنی کەسانی سەرکەوتوولەبواری تەکنەلۆژیاو ئابوریدا ئەمانەش گۆڕانێکی بنچینەییان لەبواری ڕۆژنامەگەری و ڕۆشنبیری ئینگلیزیدا کرد .


سەرچاوەکان :

١. ارنولد كيتل ، مدخل الى الرواية الانكليزيه ، ترجمة / هاني الراهب

٢. مايكل ه . ليفنسن ـ اصول ادب الحداثة ترجمة /يوسف عبدالمسيح ثروة

# بەشی چوارەم

# کاریگەربوونی ژن بەشاکاری هونەری ..

## ڕۆدینکۆ و

## خوێندنەوەیەك بۆفەلسەفەی (ئەحمەدی خانی)

(مارگریتا باریسەڤنا رۆدینکۆ ١٩٢٦ـ ١٩٧٦) ئەو ژنە مرۆڤ دۆستە بووکە لەهەنگاوێکی زانستیاندا لە ساڵی ١٩٥٥ بڕوانامەی دکتۆراکەی لە(لینیگراد) لەسەر گەورەترین شاکاری کوردی —مەم وزین —ی ئەحمەدی خانی بوو م ب ڕۆدینکۆ لەساڵی ١٩٥١كۆلیژی ڕۆژهەڵاتناسی تەواو کردووە ، بوتە خوێندکاری خوێندنی باڵا ، لەنامەی کاندیداکەیدا داکۆکی لە(( ئەحمەدی خانی )) شاعیری کوردی سەدەی حەڤدەیەم کردووە، دواتر کراوە بەکارگێڕی زانستی زانستگەی ڕۆژهەڵاتناس، لەتوانست وماندووبوونی رۆدینکۆوە جارێکی تر ئەم شاکارەزیندوێتی کرایەوە بەبەردا، خواستی دێرینی مامۆستای ئەکادیمی وکوردناس (ئۆربێلۆ ـ یوسف ئەبگارەڤیچ ئۆربێلۆ)هاتە دی

، ئۆربێلۆ مامۆستای ئەکادیمیا بوولەروسیا لەساڵی ١٩١١ ەوە دەستیکرد بەکوردناسی ودوای ئەوەی زانکۆی سانت پیتەر سبۆرگی تەواو کرد ووە، بۆئەرکێکی زانستی دەچێتەشاری (مۆکس) دوانیشتوانەکەی کوردوئەرمەنین لەوێوە خۆشەویستی بۆکورد زیاد دەکات هەوڵی فێربوونی زمانی کوردی دەدات وبەدوای شارەزابونی خۆی دەکەوێت ، لەبارەی دابونەریت وکەلتوری کوردبەشەرکی خۆی دەزانێت لەهەموو بۆنەیەکدا بەرپەرچی ئەوانەیداتەوە کەیەکەم لەکوردیان روانیوەوباس لەدەوڵەمەندی ئەدەب وکلتوری کوردی دەکات . (یوسف ئەبگارەڤیچ) هەموو وەختێ دەیوت نابێ پێدەنگ بین لەئاست ئەو نارەوایەی بەلای کەمەوە دەسەدەیە دەرهەق بەکەلتووری کوردوتوانای پەرەپێدانی شارستانییەتی ئەم میللەتەدەکرێت ، هەرلەم روانگەیەوە لای وابوو بالای شیعری (ئەحمەدی خانی ) زۆربەرزو درەوشاوەیە وداستانە شیعریەکەی یەلگەی بەهاو نرخی تەواوەتی میللەتی کوردەهەربۆیە روژ هەلاتناسانی وەك(هەارتمان و ، بەنیکتین ورۆژەلەسکۆ) خواستی ئەوەیان هەبووەکەلێکۆڵینەوە لەسەر [illegible]م وزین ـی ئەحمەدی خانی بکەن . هەروەها (ئەلکساندەرژابا) کەرۆژهەلاتناسێکی کورد بوو داوا لەمەلاو فەقێکانی کورددەکات لەسەرئەدەمیاتی کوردزانیاری بدەنێ دواجار لەساڵی ١٨٥٦ (مەلامەحمود بایە زیدی) دەناسێ ولەسەر مەم وزین نووسینێکی پێشکەش دەکات(١ـ ٢) .

دوای چل ساڵ لەخواستی ئۆربیلۆ بۆنوسین لەبارەی ـمەم وزین ـ ەوە رۆدینکۆ ئەو هەنگاوەی ئۆربیلۆی جێبەجێکرد ئەو کۆمەڵە دەستنووسە کوردییەی دەست کەوتووە کەساڵانی (١٨٥٦ــ ١٨٦٩ )ئەلیسکاندەر ژاپای کونسولی رووسی لەئەرزرووم کۆیکردونەتەوە لەزانستگەی رۆژهەلاتناس لەلینگراد پارێزراوە ، بەم نامەی کاندیدایەی رۆدینکۆ کە لەسەر مەم وزین بووە،لەدوای ئەمەوە ئۆربیلۆ دەڵێت : ئەمردم تا ئەم رۆژەم بەچاوی خۆم دی شاکارەکەی خانی بۆتە نامەیەکی زانستی چونکە ئۆربیلۆ رێزێکی بێ سنوری بۆ ئەحمەدی خانی هەبووە هەرلەبارەی (خانی) یەوە دەڵێت شاعیرو هەلکەوتووی هەمووڕۆژگار وسەردەمێکەی مەنەوەروگومانیستێکی مەزنە ،بەرهەمی خانی جەوهەرو

پاڵفتــەی توانــای داهێنەرانــەی هــەمـوو هۆشــی کوردانــە، بەناشــنابوونی کــەمێك لەبەرهەمەکانی خانی بۆت دەردەکەوێت کە کورد خاوەنی چ کلتـورێکی بـەرزبوون، ئەگـەر مۆزڤایەتی زووترئاگای لە –مەم وزین –ی خانی بوایە پێی وایە میللـە تـی کوردتووشـی ئەو بەندوباوونارەوایـە نـەدەبوو ،کـەدەڵێن کـورد میللەتێکـە کلتـوری نـەدەبی نووسـراوی نەتەوەییان نیە ،–مەم وزین– یەکەم چیرۆك و یەکەم پەخشانی کوردیە(٣) بۆیەکەم جـار –مەم وزین –ی خانی بەشـێوەیەکی زانـستی وەرگێردرایـە سـەرزمانی بێگانـەی رووسـی ، گۆڕینی سی هەزار بەیتی پڕلەیری قوڵی فەلسەفی وێنەی هونەری تـەعبیری بەرزهونـەری وەرگێرانی ربوایەتێکی واکارێك بوو هەر لەتوانای زانایەکی کوردی وعەرەبی و فارسـی زان وخـاوەن چـێژێکی باشـی ئیـستاتیکی وەك (مەب رۆدینکـۆدا) بـووە، هـیچ سـەیرنیە کەنووسەرێکی وەك(هارتمان ) لەبەرقورسی ئـەم شـاکارە نـەیتوانیوە بـچێتە ژێروەرگێرانـی یەوەهەرلەبـەر رۆشـنـایی هـەوڵ وکۆشـشی رۆدینکـۆوە(هـەژار) ی شاعیرونووسـەر ئـەم بەرهەمەی بۆشێوە زاری موکریانی وەردەگێڕێ وبۆ زمانی عەرەبیش د.عیزەدین مـستەفا رەسـول وەریگێـڕاوە. مـەم وزیـن تـەنها داسـتانێکی میللـی دامـاڵڕاو لەفیکرنیـە بـەڵکو رەسەنێتی پتە وی هەڵگرتووە لـەرووی سروشـت وسـۆفیەتی وزمـان وناکـاری کـوردەواری لەســەدەی حەڤــدەدا(٣)، بەوتــەی ئۆریێلــۆ ئەحمــەدی خــانی هاوشــانی( رۆســتافیلی جۆرجیاوفیرۆدسی ئیرانیە)(٢) .رۆدینکۆ لـەکاتی کۆکردنـەوەی ئـەم بابەتـە نووسـینەوەی تەواودا تووشی کێشەی زمانەوانی هاتووە هەرچەندە فەهرەست (قاموس)ی بەکارهێنایێت بەهۆی ئەوزمانە کلاسیکیە رۆژهەلاتیـەی ئەوسـەردەمەپێی نوسـراوە لەتـەنگ وچـەڵەمەی زمانــەوانی رزگــاری نــەبووە لەلایــەکی تریــشەوە کێــشەیەکی تــر کەتووشــی هــاتووە ئەوفەلــسەفەئاینیەی کەئاوێتــە بــووە لەنوســینی –مــەم وزیــن –دافەلــسەفەیەکی ئیسلامیانەبووە کەئەم رێبازە بۆکەسێك بیروباوەڕێکی مارکسیانەی هەبێت نووسین لەبارەوە کارێکی سـەختە ، تێدەگـەین هـەمـوو فەلـسەفە کـان لـەچ بەربەرەکانیـەکی دووردرێـژی مێژوویــدا بوون لەهەمـوو کۆمـەڵگـە مرۆڤایەتیـە کـان، هەرچـەندە کاروانیـان رۆیـشتووە

لەگەڵ بەرەو پێشچوونی تیۆریە زانستیەکان وپێشکەوتنی بۆچوونی مرۆڤ لەجیهاندا ،
کەچی جیاوازی تێنەگەیشتن وپەسەند نەکردنی رای بەرامبەر زۆر جار تەنگمان پێ هەڵدە
چنێ، رۆدینکۆرپەچەسپاوی خۆی لەگەڵ بابەتەکەدا دەگونجێنێ هیچ کات ئەوبیروبۆچوونە
ناتەبایەنە لەکاتی نوسیندا کاغەزی پێ رەشناکاتەوە رێبازی تەسەوفی خانی لەئەفلاتونی
یۆنانی کۆن وئەسپینۆزای نوێ دەچێت فەلسەفەی ئەحمەدی خانی هەمان فەلسەفەی
زەردەشتە کەلەبنچینەدا لەسەردووڕۆحی دژبەیەك بنیاتنراوەیەکەمیان ڕۆحی چاکەیەوئەوی
تریشیان رۆحی خراپیە لەهەندێ بەیتیدا لەبارەی (ئبلیس)ەوە بەم شێوەیە تەفسیری دەکات
کەئەم مەسەلەیە وەك هەڵگەڕانەوە شەیتان وایە لەجێبەجێکردنی داخوازیەکانی خودادا،
کەواتە لەهەمان کاتدا فەلسەفەی خانی دامەزراوە لەسەربنەمای تەسەوفی ئیسلامەتی
بەلاّم لێرەدارێ‌بەرووبوونەوەکە دادەبەزێت بەرەوئاستێکی زانستیانە لەتەسەوف وپەیوەستی
دەکاتەوە بەلایەنی وەرگرتنی فیکروئاکارلەهەموئاین وئاینزا فەلسەفیەکان ، ئەم وەرگرتنە
بەئاشکرا بەدی دەکرێت لەلای خانی لەزۆر بەی جێگادا، چونکە چیرۆکی هەڵگەڕانەوەی
شەیتان لەداخوازیەکانی خودا بەشێوازی تر لەئاینەکانی میللەتانی تردا باسیان
لێکراوە وەك لەئاینی جۆری هیندیەکاندایەك کەسایەتی هەیە لەشەیتان دەچێت ناوی
(ئەلارا)یە لەمەردندا دەست دەگرێت بەسەر شەشەمین ئاسماناوهەموئەوانەی لەزەویشدایە
هەروەها لەلای بوزایەکان (ئەلارا)ی هیندیەکان رۆڵی سیخوری خۆی دەبینێت .

هەروەك لەناوکوردیشدا شەیتان زۆر جاردەشوبهێنرت بە(مار)لەئاینی مەسیحیشدا
(تەنین) هەمان شێوەی هەیەهەموئەمانە لای خانی لەرۆڵی (بەکر)دا تەوزیف دەبێت
هەروەها (تاژدین ) یش لەدووجێگادا دەشوبهێنێ بەشەپۆڵی (تەنین) هاوکێشەکە بەم
شێوەیە (ماروتەنین)و(شەیتان وئیبلیس)هەندێ جار (بەکر)هەردووکیانە ، لەم
هاوکێشەیەدا پەیوەندیەکی ئاشکرا بەدی دەکرێت لەنێوان خانی وئەفسانە هیندیەکان
وبیروباوەڕی یەزیدیەکان لەبارەی ماروپیرۆزەکردنی مارلەوێنەی
مارلەچیرۆکەفولکلۆریەکاندازۆرە بەتایبەت ئەوچیرۆکانەی بلآوە لەناوئاینی یەزیدا هەیە،

لەناو دراوسێکانیشیاندا کەئیسلامەتی بەهەمان شێوە وەك نەکوشتنی مار لای نەقشبەندیەکان .

سەبارەت بەچیرۆکە شیعریەکەی ئەحمەدی خانی دەتوانرێت خوێندنەوەیەکی پۆزەتیڤانەی بۆبکرێت سەبارەت بەوچەرخەی کتێبیدا ژیاوە چ بەنیسبەت ئەدەبی رۆژهەلاتیەوەبێت رەنگە تووشی کێشە ببینەوە بەهۆی کەمی سەرچاوەوە لەو سەردەمەدا بۆیە تەنها پشت بەسەرچاوە مێژوویەکان وەك بنچینەیەك بۆتێگەیشتن لەگەڵ ئەو چەند دیوانە چاپکراوانە دەبەستین گەر خوێندنەوەیەکی هاوچەرخانەی بۆبکرێت پەیوەندییەکی ئەندامی تەواوی لەجموجۆڵی ئەدەبی ئەو چەرخە داهەیە بەهۆی یەکبوونی دیالێکتەکان ، نەتەوەیەکا مەهی میلەتێکی ترە ؟ئەمە لەئەدەبی رۆژهەلاتی ئێستادا زالە وەك دیاردەیەکی خودیەتی وبابەتیانە ، هەروەها پەیوەندی مێژووی وشارستانی وفیکریش کاری کردووەتە سەر لێکدانی زمانەوانی ورەوانبێژی بۆیە ئەگەرخانی بنووسینەوە شاعیرێکی سەردەمەکەی خۆیەتی لە نێو شاعیرانی رۆژهەلاتدا ،کەواتە مێژووپێچەواندەمێتەوە لەنێوان کوردورۆژهەلاتیەکاندا لەسەردەمێکی مێژوویدا لەرێگەی رەنگدانەوەئەدەبیەکەیدا.

| | |
|---|---|
| ئەبوت بەخەم ئەی هاوەڵی ژاریم | فریارەسی زام ودەردی کاریم |
| پۆشاکری ئەدارو خاکساران | خۆراك وبژێوەکەی هەژاران |
| هاورازونیاز ی دەردەداران | هاودەنگی نەخۆش ولەش بەباران |
| پێخوری لەبەردەمی گدایان | هاوپیاڵەی کوری بێ نەوایان (٤) |

خانی توانایەکی لەرادەبەدەری بۆ ئافەریدەکردنی رەگەزی جوانکاریی هەبووە بەربتمی مۆسیقا ی ئاهەنگ ئامێروشەی رەونەقدارو تۆکمەوپرواتای خستوەتەروو، بەروحیەتێکی مۆسیقیانەوە وێنەیەکی ئەدەبی کێشاوە کە لەبەیەکەوە گرێدانی وێنەو ناوەرۆك هارمۆنیا یەك دروست دەکات ، لەدیمەنێکدا (تاژدین وجاکۆوعارف) دەچن بۆلای میر (مەم)

بەریـدەن ، هەمووئـەم دیمەنــە پڕەلەئازایــەتی وســووربون وداواکــاری ، شــاعیر دەچـێتەناو قوڵاییەکەوەلەرێگەی ویستی ڕووبەڕووبونەوە ، ج شێوەیەك لەخۆیەکوشتدان دەتوانێـت ئـەو مۆسیقایە دەربڕێت بەوشە ..

گورزان بهەژین رمان ببازین تەڤ رەنگە مەمی ژمیرخوازین

شاعیروێنەی ژیانی دەکێشێ وئاوێتە بەژیانی سووری ڕووەکـی دەکـات ، لەکێلانـەوەی بەرەو چاندن وهاڕین لای ئەو (هاڕینی ژیان) بەلاّم ئالەتی هاڕینی بیرناچێت کەئـەو کـارە دەکات کەبریتیە لەدەم زامان وگوێچکە ئە و ئاوەش کەئاشەکەی پێدەگێڕێت:

وەقتێ رەسیاوبوویە خۆشە     وی دی بقتن ژێرێی تووشە

ئاشتی دەڤ رچەقچە قازوبانان     ئاڤادەهەن وبەرێ ددانان

گەر خوێندنەوەیەك لەبەرامبەئەدەبی گەلانی تر بۆخانی بکەین یاباشتر بڵێین بەراوردێك لەنێوان خانی وئەدەبی ڕۆژهەڵاتیدا بکەن ، گەرانەوە بۆووردەکانی لەئاسـت شـوێن و کاتـدا قورسە دووریـشمان دەخاتـەوە لەخوێندنـەوەی خـانی وەك شـاعیرێك ، زیـاتر دەبێـت وەك بیریارێـك یـان سـۆفیەك تەماشـای بکـەین ، چـونکە خوێندنـەوەی شـاعیرێك پێویـستی بەشوێنی دیاریکراوەهەیـە لەسـەر دەمەکـەی خۆیـدا وەك نمونـەی بەرەوپێشـچوونی ئـەدەبی گەلەکەی .

شـوێنی یەکـەمی وەك بیرمەنـدیك دەبـەوێت شـیعرهۆیەك بێـت بۆشـیکردنەوەی بیروبۆچوونەکانی بەشێوەیەکی دیاردەرکەتوو ، هەروەها دەبەوێت خـۆی وئـەدەبی گەلەکـەی وزمانەکـەی لەشـوێنێکی شایـستەدا جێبکاتـەوە لـەنێوان گـەلانی خۆرهەڵاتـدا ، بـەلاّم خوێندنـەوەی وەك شـاعیرێك لـەریزی شـاعیرانی پـێش خۆیـدا نـەبێت نـاتوانین دایبنـێین بەتایبـەتی لـەڕیزی گەورەشـاعیرانی ڕۆژهـەڵاتی وەك (فیردەوسـی و نیزامـی و جـامی وجـەلادینی رۆمـی فـزولی وهتـد ـ ) ئەمـە بەلایـەنی کەمـەوە ئەمەتـەنها لەچوارچێوەی قەبارەیـەکی دیـاریکراودا بیهێڵینـەوەو گرنگی بەلایـەنی فیکـری فەلـسەفیانەی نـەدرێت ئـەوەش ناگونجێـت لـەڕووی مەبدەئیانـەوە هـیچ بایـەخێك بـۆرادەی بیرمەنـدی ورادەی

تێگەیشتنی لەدەوروبەرەکەی گرنگی پێنەدرێت وئەژمارێك بۆسۆنگەی فیکری نەکرێت .
رادەی تێگەیشتنی خانی لەوەدا دەدرەوشێتەوە کەرێزبەرۆڤایەتی دەبەخشێ بەبونیاتی
رەگەزەکان لەنێرومێ لەرێزگرتن لەهەردووکەسێتی (زین) وەك کچێکی بەو.ـ
و(مەم)وەك کوڕێکی بەوەفا بۆ خۆشەویستیەکەیان رەنگ دەداتەوە.

# خانی وهەژاندنی چیرۆکە شیعری

کورتــه چـیرۆکی شـیعری لیریکـی ئـەورووپی لەئـەدەبی ئەورووپیــدا بەوەجیادەکرێتــەوە لەچیرۆکە شـیعرکورتترە لەوانەیــە لەچـەند بـەیتێك تێپەڕنـەبێت کەتـەنها چـەندخولەکێکی دەوێت بۆخوێندنەوە، زۆر یێك لەرەخنەگران دەبیەستنەوە بەهونەری شێوەکاری کـەوەختێکی کەمیان دەوێت بۆ چێژلێوەرگرتن ڕوونترە بڵێین پێشت نابەستێ بەرەگەزێکـەوە کـەکاتێکی زۆر ی بووێت واتە هەروەکو تابلۆیەك چەند ساتێك پێی دەگـەین بۆزەمـەنێك بـەلاّم مۆسـقا بۆچەندان ساتی تر، دەتوانین چێژی لێ ببینین هەروەها چـیرۆکە شـیعری گـۆرانی ئـامێزی بەوە جیادەکرێتەوە لەیەك بیرۆکەدا خۆی دەبینێتەوە یان لەیـەك وێنـەدا، واتـە لەیـەك تـۆنی مۆسیقا دا یان لەیەك ئاوازی بنەڕەتیدا لەگەڵ ئامانەشدا وێنە بەشداریەکی تـەواو لەکورتـە چیرۆکی شیعریدا دەکات لەسەودای شوێن وکاتێکی تایبەتدا، دیمەنەکـە دەسـت پێـدەکات لەو شوێنەدا لەهەمان شوێندا کۆتـایی پێکـدێت(٥ــ ٦) ، هـەروەها زۆر بـەی جـار ئـەم چیرۆکانە خۆیەتیە(زاتیـە) بـەلاّم لەسـەم وزیـن دا ڕاسـتە دارشـتنەکەی لەشـێوەی چـیرۆکە شیعردایە بەلاّم گـەر بـەراوردبکرێت لەگـەڵ کورتـە چـیرۆکی شـیعری نـوێی ئـەورووپادا ، ئەحمـەدی خـانی چـیرۆکە شـیعریەکەی درێژەولەزەمـەن و شـوێنی جیاجیـادا بنیـاتی نـاوە خۆیەتی نیەو چەندان کەسایەتی بەشداری تێدا کردووە. سـەبارەت بەبیروفەلسـەفەش باسـی لێوەکراوە،لەرووی هونەری مۆسـیقاو وشـەو وێنـای شـیعریەوە ئـەوا یەکدەگرێتـەوە لەگـەڵ کورتە چیرۆکی شیعری ئەورووپادا .

خانی لەوێستگەی مێژوویدا

| | |
|---|---|
| پرسیم لەجیهان رەقی لەبەردی | نەرمیت بەچیە ؟ گوتی بەمەردی |
| دنیا کە وەها بەبەخشش وشیر | بۆپیاودەسەمۆ دەبێت |
| سا خوایە لەتۆ سەیر دەمێنم | لەو گێژ چلۆن سەرم دەرێنم(٤) |

ناوەڕۆکی ئەم شاکارە دەمانباتەوەئەو سەردەمەی کورد وەمیرنشینە کوردیەکان بەدەست هەردوو ئیمپراتۆریەتی فارسی وعوسمانی لەکێشمەکێشم ورووبوونەوەدا بوون، مەسەلە کوردیەکان دەوروژێنێ لەگەڵ رۆحی هەڵگەڕانەوەدا لەدوژمنان لەهەمان کاتداسەرشۆڕی وسازش ودەست سورکردن بەخوێن ناخوازێت . بەلکو وەکورۆڵەیەکی تێگەیشتووی گەلەکەی بارودۆخی کورد زیاتر دەبەستێتەوە بەنەبونی سەرکردایەتیەکی لێهاتوو بەهۆی سەرەکی نائومێدی کوردی دادەنێت ، بەعەیب وعار ناوزەدی بارودۆخەکەیان دەکات ، دەیەوێت بەواقعی چارە سەری کێشەی گەلەکەی بکات بەسوودوەرگرتن لەمێژووی دووروودرێژوئەزموونی گەلانی تر . لای خانی فیکری رەخنەیی دەستەواژەی بۆکراوە ، وەکو لەهەندێ بەرهەمی پاڵەوانێتی رۆژ هەلاتیدا بەتایبەت لای هەندێ شاعیر دەبینینەوە ، خانی بەپێی رۆژ گارەکەی خۆی رەخنە گرتنە کەی بەسەر دوو دەستەدا دابەش دەکات ، لەبەر قوڵی رۆشنابی بیروڕادا دەگات بەچوارچێوە گشتیە کە کەلەرەخنە گرانی ئەمرۆشدا بەدی دەکرێت یان پێویستە بەو شێوەیە بن ، وەك ئەوەی داوا لەو خەلکانە دەکات کەسەر دەرچوون ودڵیان پاك وبێگەردە پشتگیری لەو شەی هەنگوینی بکەن ، هەروەها رووبەڕووی ئەوانە دەبێتەوە کە خەلکی بەتوانان تکایان لێ دەکات واز لەرەخنە گرتن بێنن وزانست وسوود بەخەلك بگەیەنن واتە خانی داوای زانست دەکات کەواتە خانی خۆی لەخانەی پڕاوپڕیدا دانەناوە کەهیچ کەموکوریەکی نەبێت بەلکو وەك مرۆڤێکی سادەوساکار باسی خۆی دەکات لەبەر دەم لیزانانی ئەدەبدا .

هەموئەمانەش زیاتر گەورەیی وبلیمەتی خانی دووپات دەکەنەوە بۆیەمێژووش کەسانی وەك ئۆریبلۆورۆدینکۆ دەباتە وە سەر چاوگە روونەکەی خانی بیری بەرزو وشەی جوانی لێ هەڵدەگوزن ، لەگەڵ ئەمانیشدا سەرنجی گەلێك لەشاعیرو وەرگێرە سۆڤیەتیەکانی تریشی بۆلای خۆی راکێشاوە بەعەزرەتی بەشیعر دارشتنەوەیە بوون ، بەلام کەسیان ئەم ئاواتەیان بەدی نەهێنا رەنگە هەستیان بەوە کرد بێت یەکێك دەتوانێت ئەو

بۆیە مایە بکاتە رووسی وەربگێڕێت کەبلیمەتی ئەحمەدی خانی وبەهرەی بەرزی شیعری ئەوی هەبێت .

سەرچاوەکان :


١- چەندوتارێکی کوردناسی ـو-ئەنوەر قادر٢٠٠٤

٢- احمدی خانی –شاعیراوفکراو فیلسوفا ومتصوفا د.عزالدین مصطفی رسول .

٣- مەم وزینی مەلا مەحمودی بایەزیدی د.فەرهاد پیرباڵ

٤- مەم وزینی خانی –هەژار

٥- الادب وفنونه د.محمد عنانی .

٦- اوکتافیوباث –الشعرونهایات القرن ، تألیف / ممدوح عدوان

# وێنەو شیعر

ڕەنگە شتێکی نامۆنەبێت لەلای زۆرێك لەئێمە پەیوەندی هاوڕەنگی و هاوگوزارشت نێوان تابلۆو دەقی شیعری، بەتایبەتی کاتێك تابلۆ پڕ تێڕامانەکان کێشران و پەیکەرە بەناوبانگەکان لەلایەن هونەرمەندە داهێنەرەکانەوە داتاشران ئەمانە بوونە جێی سەرنج و قوڵبوونەوەی ئەندێشەی شاعیران و دواتر دەقی گوزارشت نامێزیان لێکەوتووەتەوەو زۆربەی کارە شێوەکارییەکان بوونە هەوێنی بەرهەمی جوان و ئەندێشەی قووڵی شاعیران.

بۆ زیاتر قوڵبوونەوە لەم بابەتەو سەلماندنی ئەم پەیوەندیە دکتۆر عەبدولغەفار مەکاوی لەکتێبی (قصیدە وصورە) ی کە ئیشکردنێکی وردەو خوێندنەوەیەکی قووڵی بەراوردکاریانەی نێوان شیعری شاعیرە گەورەکانی جیهان کردووە ، بەرهەمی شێوەکاری هونەرمەندانی بەنمونە هێناوەتەوە لەنموونەی ئەو بەرهەمە شێوەکاریە گەورانەی بەچەندان شاعیر شیعریان بۆ وتووەو شیعریان لەوێوە هاتۆتە بوون وکارەکانیان بەسەرچاوەی ئیلهامی شیعرەکانیان دادەنرێت پەیکەری کچانی ئەکرۆبلیس و خودای ساتە مردنیەکان (کایروس)و پەپۆلۆو پەیکەری سەرکەوتنی نیکا لەساموزراکاو پەیکەری پاڵەوانی دەستبەسەرداگیراو، پەیکەری ڤینۆس میلۆو تابلۆی حەواو فبرایرو پەیکەری مامۆستاو فێرخوازو پەیکەری تابلۆی ئیلاریا دلی کاریتۆو فریودانی قەدیس ئەنتۆنیۆس و تابلۆی ئیکارۆس و تابلۆی کوێرەکان، هەڵکۆڵراوی خەمۆکی و سەرکەوتنی جالاتیاو تابلۆی شەوو کۆیلەی دەست بەسەرداگیراوو برۆمسیوس و لەسێدارەدانی گاکان و .. هتد هەموو ئەم کارە هونەریە بەرزانە بەرهەمی هونەرمەندانی وەك مایك ئەنجیلۆو گۆیاو لیوگاریس و چەندانی ترن.

نووسەر بەم شێوەیە پێشەکی کتێبەکەی نووسیود سەبارەت بەو پەیوەندیە توندوتۆڵەی لەنێوان شیعرو کارە هونەریە شێوەکاریەکاندا هەیە.

ئایا تاقیتکردۆتەوە کاتێك لەبەردەم تابلۆیەکدا یا پەیکەرێك یا وێنەیەکدا رادەوەستیت وا هەست دەکەیت زمانی شاعیرێك قسەت لەگەڵ دەکات و گۆرانی و ئاوازێك دەدا بەگوێتدا؟

رەنگە لەبەرخۆتەوە بڵێیت بەراستی پێی سەرسامم! ئەمە بیروبۆچوونێکی سەیرە، بەڵام ئەمە بیروبۆچوونێکە تێدەپەڕێت و دەتبات بەرەو بڕینی رێگایەك، هەموو ئەو تابلۆو وێنەو پەیکەرانەی بەناویاندا دەگەڕێیت و لەپێشانگایەکدا تێیدا نقوم دەبیت و کاریگەری لەسەر ویژدان و عەقڵ بەجێ دێڵێ بێ ئەوەی هیچ شتێك لەنێوان تۆو ئەودا هەبێت لەوساتەدا پاڵەپەستۆیەك لەسەر بیروبۆچوونەکانت لێرەو لەوێ دروست دەبێت، بەڵام زۆربەی جار ئەو حاڵەتە بەردەوام دەڕوا لەگەڵت و لەزەمەنێکی دوورتردا بیرکردنەوەت دەچێتەوە سەری، یان وەستان و تێڕامانەکە درێژە دەکێشێ بەرەو بیروبۆچوونێکی تر وەك ئەوەی کە لەلای سەدان شاعیرو هونەرمەندی شێوەکار رەنگی داوەتەوە بەدرێژایی سەدان ساڵە کاریگەریی وئاڵوگۆڕ لەنێوان ئەم هونەرانەدا دەکرێت.

چیرۆکی کاریگەری هونەرەکان لەسەر یەکتر بەتایبەتی هونەری شیعرو هونەری وێنە چیرۆکێکی دوورو درێژە دەگەڕێتەوە بۆ سێ هەزار ساڵ لەمێژووی ئەدەب و هونەر لەخۆرهەڵات و خۆرئاوادا، لەرێگەی هەموو ئەو پرسیارو وەڵامانەی کەشاعیرەکان و کارە هونەرییەکانی بەیەکەوە دەبەستەوە، پێشوازیکردنی ئەو لافاوە زۆرەی شاعیران و هونەرمەندان لەبارەی پەیوەندی هونەرە جوانەکان بەیەکتریەوە بەشێوەیەکی گشتی یا لەبارەی هونەری شیعرو وێنەوە بێت بەشێوەیەکی تایبەتی ئەویش لەو پەیوەندیە هاوبەشەوە دێت کە لەبناغەدا هەموو هونەرەکان دەکاتە خوشك و برا، یا ئەو جیاوازیە کە لەجەوهەردا هەیانە هەریەکەیان لەوی تر جیادەکاتەوە، جیاوازیەکی دابڕاوە رێگەنادات بەبەراوردکردن و لێکۆڵینەوەو ئاڵۆزی و پێداهەڵچوون لەنێوانیاندا، لەئەدەبی خۆرئاوادا لەهۆمیرۆس و فێرجیل-ەوە بۆ کیتس و رامبۆو رالکاو ئۆدین دەستیپێکردو تائێستاش بەردەوامە، هەروەها لەئەدەبی عەرەبیشدا ئەم رەنگدانەوەیە هەبوو هەر لەسەردەمی ئیمروقەیسەوە

شاعیری دیوەخانەکان و ئەبونەواس و موتەنەبی و ئیبن رۆمی هەتا ئەحمەد شەوقی و مەتران و ئەحمەد زەکی و ئەبو شادی و هەندێ لەشاعیرانی بزووتنەوەی (ئەبوللو) وەك حجازی و بەیاتی و سەعدی یوسف و سەلاح عەبدلسبور، هەروەها لەشاعیرەکانی خۆرهەلاتی دوورو نزیك ئەم رەنگدانەوەیە هەبوو تادەگات بەئەمرۆ سروش (ئیلهام)ی شاعیریان لەکارە شێوەکارەکاریەکان (وێنەکێشان و وێنەی گیراو پەیکەرتاشین و تەلارسازی) لەگەلْ دەنگی مۆسیقا سەرچاوەی گرتووە.

دەتوانین بلێین ئەو شاعیرانەی کە لەکاریگەری وێنەو تابلۆو پەیکەرو کارە هونەریەکانی تر لەدایك دەبن جیاوازترن لەبەرهەمی شیعری تر، چونکە دەقێکن پرن لەوێنای شیعری چەسپاوو گۆرانی ئامێز.

مێژووی ئەدەبی خۆرئاوایی لەسەردەمی ئەغریقی و رۆمانیەکانەوە ئەم شێوازە ئەدەبیەی ناسی کەدەتوانین ناوی بنێین (قەسیدەی وێنەکان) ئەم شێوازی شیعرنووسینە مێژوویەکی کۆنی هەیە کەهاوکاتە لەگەلْ مێژووی ئەدەب و هونەر خۆیاندا، هەر کارە شێوەکاریەکان بوون وژدانی شیعریان بزواندو شاعیرانی هاندا بۆئەوەی ئەمریان پێ ببەخشێ لەرێگەی دارشتنی زمانەوە نووسران و چانسی مانەوەی دا بەزۆربەیان .

قەسیدەی وێنەکان لەرەخنەی هونەری کۆنترە، بەلاْی زۆربەی لێکۆلْیارانەوە لەویش گرنگترە سەدەی بیستەم گەشەکردنێکی زیاتر بەخۆوە دەبینێت لەئاست سەدەکانی رابردوودا، لەژمارەی زۆری گەنجینەی زمانەوانیەوە کەبووە هۆی گرنگیپێدانی زۆرێك لەرەخنەگران و خوێنەرانی چێژوەرگری ئەم جۆرە نووسینە.

قسەکردن لەسەر قەسیدەی وێنەیی باسێکی زۆر لایەن و رەهەندەو بەراوردکردن لەنێوان هۆنراوەو ئەسلْی هونەردا کەشاعیر دەیەوێت وەسفی بکات و یادگاریەکانی لەگەلْدا تۆماربکات و ئاوێتەی روخسارو رۆحیەتی و وادەکات رەخنەی بابەتی سەردەمەکەی خۆی بێت .

ئەم بەراوردکردنە خۆی هەروا کارێکی ئاسان نییە، بەقەدەر ئەوەی هاوسەنگییەکە لەنێوان کارکردنی هونەرمەندان و مامەڵەکردن لەگەڵیدا لەیەک کاتدا زیاتر لەدەرگایەک بۆ رەشەبای پرسیار دەکاتەوە، سروشتی هونەرو ئەرک و بۆچوونەکان پەیوەندی بەژیانە و واقیع و کۆمەڵگەوە پەیوەندی هونەرێکە بەهونەرێکی ترەوە، شاعیری ئەمریکی (عەزرا پاوەند) دەڵێت: کاری هونەری بەرهەمدار لەڕاستیدا ئەوەیە چەندین تەفسیر هەڵبگرێت بۆ سەدان ئیش لەرەگەزی ئەدەبیکی تر، ئەو کارەشی کۆمەڵێک هەڵبژاردەی لەوێنەو تابلۆ تێدایە ناوەرۆکی سەدان قەسیدەیە .

سەبارەت بەم دەستەواژەیە شاعیرێکی گەورەی رۆشنبیر کە زۆر شارەزایی ئەدەب و زمانی جیهانی بوەدەڵێت:

گوزارشتی شاعیرەکان بۆ کاری هونەری کارێکی داڕێژراوە، چونکە کاری هونەری راستەقینە ئەوەیە کە بەچەند کارێکی هونەری هارمۆنی پەیامی خۆی بگەیەنێت، ئەلتەرناتیڤی هونەرێکی پڕداهێنان گومانی تێدانییە رێخۆشکەرە بۆ داهێنانی کارێکی هونەری تر، هەموو فەلسەفەی هونەرو رەخنەی ئەدەبی نوێ شانبەشانی یەک دەڕوات لەکاتی خوێندنەوەی قەسیدەیەکدا یا بینینی تابلۆیەکدا جۆرێک لەخولقاندنی بۆ دەگەڕێتەوە، قەسیدە یا وێنا دەگونجێت هەریەکەیان بەچەند دەلالەتێك پەیامی خۆیان بگەیەنن بەقەدەر ئەوەی گەر بواری خوێندنەوەیان بۆ رەخسا، شتێکی سروشتییە لەدوای ئەمەوە وێنای قەسیدە شتێکی بەرجەستەکراوییت و بەسەدان کاری شیعری بێنێتە بوون بەتایبەت لەمێژووی خۆرئاوادا، کارلێکردن لەنێوان زۆربەی هونەرەکاندا بەلای زۆربەوە کارێکی داهێنەرانەیە.

لەگەڵ ئەوەشدا دەزانین مێژووی هونەرو رەخنە زۆر قسەی گوماناوی هەیە بۆ ئەو ردگەزە ئەدەبییە، بەئاگاییەوە لەزیادەڕۆیی گرنگی هونەرو ئەدەب و بەراوردکاریەکەی دەدوێن، هەروەك ئەو وشانەی لەبارەی جۆری سروش (ئیلهام)و بەزیندووهێشتنەوەو هیواخوازی و هاوتەریبی شیعرو تابلۆو تابلۆی شیعرووتراون، زۆری تر لەدەستەواژەی

گـرنگ ووتـراون کەمێـژووی رەخنـەی هونـەری شـانازی پێوەدەکـات لـەو سـەردەمەوەی دەستەواژە بەناوبانگەکەی ئەرسـتۆو هۆراس دەرکەوت دوای ئەوە بەلگەنەویـستانە پەیوەنـدی نێوان هونـەرەکان گومـانی لای کـەس نەهێشتەوە، ئـەوە بەسـە بۆئـەوەی گـەر تەماشـای هەندێك لەو دەستەواژە دەربڕینە باوانـە بکـەین کـە لەرەخنەیـەکی هونـەری ئەدەبیـدا هەیـە تابزانین ئـەو پەیوەندیـە راسـتی و نادیـاری دەگەیـەنێت لەیـەك کاتـدا ،وێنـاکردنی وشـەو ئاوازەکانیان یەك جەستەیی بیروباوەڕو رەنگی گۆرانی و کەسـایەتیەکان. هتـد بناغەیـەکی مۆسیقی رۆمانسی تەلارسازیانەیە.

هونەرەکان بەهەموو شێوە جیاوازەکانیـانـەوە وەك ئـەوەی ئەرسـتۆ جـەختی لێدەکاتـەوە لەسـەرەتای کتـێبی (هونـەرو شـیعر)دا ئـەوەی لەوێنـەکردنی ژیانـدا بەشـداری دەکـات لەتایبەتمەندیە بنچینەیەکانی (میزیس)ە یا چیرۆکەکانی بۆیە پێویستە شـیعرو وێناکـانیش وەسفی هونەرەکان هەلگرن لەرووی گێرانەوەو بەکارهێنانیان ودروستکردن وبنیاتناندا یەك پرانسیپن ئەو چیرۆکە یا ئەو گرێیە لەئامرازو ناخۆشی (تراژیـدیا) دیـزاین و نەخـشەکردنی لەوێنەکێـشانێکی شـیعردا لای ئەرسـتۆ هونـەرو هونـەری چـیرۆکنامێزە، شـاعیری چیرۆکەکان هەروەکو وێنەگرێك وایە .

شتێکی سروشتیە لەنێوان هونەرەکاندا پەیوەندی هەبێت، هەروەك شیشرۆن لـە١٠٦- ٤٣ پ.ز دەڵێت لـەدوای ئـەو پەیوەندیـە وردەوەدەقـەکان ناسـکترن" ئـەم دێـڕە لەکاتێکـدا دەڵێت کە داکۆکی لەئەرخیوس دەکات، هیچ ئەستەم نییە بۆ هەریەکە لەمرۆڤەکان یەکـەم بەیەکگەیـشتنی پەیوەنـدییان لـەنێوان شـیعرو مۆسـیقادا بێـت وا هەسـت بکـات ئـەم پەیوەندییەی نێوانیان راستەوخۆ درێژ دەبێتـەوەو رەگ دادەکـوتێ لەتێگەیـشتنی شـیعرەکە خۆیدا، ئەوە بەسە بۆئـەوەی بڵـێین شـیعر جیانابێتـەوە لـەکێش و مۆسـیقاو گـۆرانی وتـن، شیعری گۆرانی وشەکەی لەبنـچینەدا یۆنانیـە کـەپێی دەڵـێن شـیعری لیریکـی لەئالـەتی مۆسیقی (لـیرا)ەوە هـاتووە کـە لەگـەڵ گۆرانیـدا بـەکاردەهێنرا، هـەروەکو لەسـەدەکانی ناوەڕاسـتدا شـیعر پەیوەنـدی راسـتەوخۆی بـەژەنین و گۆرانیـەوە هـەبوو لەرێوڕەسـمە

کەرنەڤاڵیـەکانی ئەنـدەلوس و گۆرانیـەکانی تـەربادور لـەبرۆفانیس و لـەنێو زنجیـەکانی ئەڵەمـانیاو هەتاوەکو مۆسیقا بـووە فـۆرم لـەلای سیمبولیـستەکان لەشیعری شـاعیراندا لەکۆتایی سەدەی نۆزدەو سەرەتای سەدەی بیـستەمدا نموونەیەکی بەرزو نەگۆڕ بوو.

ئەگـەر وەرچـەرخانێك بکـەین لەمێـژوو هونـەرو رەخنـەو ئەدەبـدا دەقـی زۆرمـان دەستدەکەوێت کەنزیکن لەهونەرەکانەوە، هاوتەرییـەکی هاوبـەش یەکبینـە لەنێوانیاندایـە لەبناغەو هۆکارەکانیاندا گەرچی لەڕووی دەربڕینەوە جیاوازن و بەپلیکانەی قـایم و بـەهێزدا سـەردەکەون، نـاتوانین ئـەو وتـە بەنرخـە لەبیربکـەین کـەدەڵێت: ئـەوەی دەیـەوێت وەسـفی پەرستگاری گریکەکان بکات ئەوا دروسـتبووە لەمۆسـیقا، ئەوەشـی دەیـەوێت بـەراوردێك لـەنێوان پەرسـتگاکان و تراژیـدیای گریکەکانـدا بکـات یـا ئـەوەی دەیـەوێت دڵنیابێـت لەکاریگەریەکانی قوتابخانە فەلسەفیەکان لەسەدەکانی ناوەڕاستدا لەسەر تەلاری کەنیـسەی قوتیەکانی بابۆ دواهەمین نهۆم سـەرکەوێت لەوێدا بەڵگە لەسەر گەورەیی خوداو جوانترین ئافەریدکارەکانی هەیە.

هیچ رێگایەك نیە بۆئەوەی ئینکاری بکەین لەپەیوەندی نێـوان هونـەرەکان، ئـیتر ئایـا وای دابنێین پەیوەندیەکی هاوتەریبە یا ئاڵوگۆڕو کارتێکردن و کاریگەریە، کاریگەریەکەش بەدرێژایی سەردەمەکانی ئەدەب بووە، ئەم مەسـەلەیە شتێکی بەڵگەنەویستە ئەگەر کەمێك بـەراوردی بکـەین بەبیرکردنـەوە، کـاتێکیش بـەدوای ئـەم پەیوەندیـەدا دەگـەڕێین لـەنێوان هونەرەکاندا لەڕووی سروشتی بوون و ئەرکەکان و هۆکارەکان و شێوازی جوانی دەربڕینیان ئەگەر بمانەوێت ناشناترین لەمێـژووی ئـەدەب و هونـەرو رەخنـە حکـومی دژبەیـەك و رای جیاواز بەرادەی تێکـەڵاوبوون و بەکداچـوو گومانـاوی و پارسـەنگ دەبینینـەوە، سـەبارەت بەئەدەبی رۆمانسی ئەڵەمـانی (ئۆگـست شـیگڵ) رەخنـەدەگرێت لـەوەی بۆنموونـە ئـەدەبی کلاسیـکی بەسروشتی خۆی نزیکە لەپەیکەرتاشیەوە، هەروەها ئەدەبی نوێ و رۆمانـسیەت نزیکە لەتابلۆو وێنەوە.

هەروەها رەخنەگری هونەری بەناوبانگ (هێربارت رید) لەوتارێکدا سەبارەت بەهاوئاهەنگی نێوان تابلۆی ئینگلیزی و شیعر لەنێو ئەو کتێبەیدا کەداکۆکی لەشێلی دەکات، هەموو ئەو وتارانەی تریشی کە لەساڵی ١٩٣٦دا نووسیویەتی دەچێت بۆئەوەی کەکێشی شیعر لەلای ئەنجلۆ سکسونین دەتوانین بەراوردی بکەین بەزەخرەفەکانیان، هەروەها ئەو دیمەنە سروشتییەی کەهونەرمەند جینز بۆرۆ لەتەمەنی لاویدا وێنەی کێشاوە لە١٧٢٧-١٧٨٨ ژیاوە ئەو شیعرەی کۆلیز-مان بیردەخاتەوە کە لەساڵی ١٧٢١-١٧٥٩ ژیاوە شیعرەکەی بەناونیشانی (سروودێك بۆ شەو) لەگەڵ ئەوەی هەندێ لەو دیمەنە سروشتیانەی تری ئەو هونەرمەندە کە لەکۆتاییەکانی تەمەنیدا کێشاونی سیفەتی شیعرەکانی شاعیر وردز وۆرسمان ١٧٧٠-١٨٥٠ بیردەخاتەوە.

زۆرێك لەرەخنەگرانی ئەوەیان دەرخستووە کە ئەو پەیوەندی و کاریگەریەی نێوان هونەرەکان دەگەڕێتەوە بۆ دامەزراندنی سەردەمی باڕۆکی وەك لەنموونەی شیعری شاعیران (تومسۆن ویۆنگ و گرای و کۆلینزدا) دیارە، لەهەمانکاتدا زۆرێك لەرەخنەگران تووشی گومانمان دەکەن بەوەی کەجارێك شیعری کیتس ١٧٩٥-١٨٢١ بەراوردەکەن بەوێنەو جارێك بەهونەرو کارە هەڵکۆڵراوەکان و جارێکیش بەمۆسیقا!

سروودە بەناوبانگەکەی کیتس کە بۆ قاپی ئەفریقی (وعاو افریقی) وتویەتی دەتوانین بەراوردی بکەین بەهونەری بەرزی هەڵکۆڵین و بەتابلۆش لەهەمانکاتدا، سەبارەت بەم شیعرە شاعیری گەورەی ئێرلەندی (ییتس) دەڵێت کیتس لەشیعرەکەیدا وێنەیەکی کێشاوە ناتوانین لەبیری بکەین، بەئاوازی گۆڕانی وێنەی چینی دەوڵەمەندە، هەروەها رەخنەگرێکی تر رەنگی شینی نێو ئەم قەسیدەیە بەراورد دەکات بەو رەنگە شینەی لەتابلۆکانی وێنەکێشی ئینگلیزی (رینۆلدز ١٧٢٣-١٧٩٢) بەکارهاتووە، رەخنەگری سێیەمیشیان لەنێوان سروودەکەی بۆ عەندەلیب پەیوەندی چڕدەکاتەوە لەگەڵ جوڵەی هێواشی ئەندانتی لەسیمفۆنیای یەکەمی برامزدا.

رەخنەگرێکی تریش کاریگەری شیعرەکانی لەناخی خوێنەردا دەگەڕێنێتەوە بۆ کاریگەری وێنەی (تیرنر ١٧٧٥-١٨٥١) ئەوی کە دەیبینێ و چێژێکی جوانی هەیە بۆی.

لەم نموونانەو زۆری تریشدا دەردەکەوێت کەپەیوەندی شیعر بەوێنەوە زۆر لەوە زیاتر شاعیرو رەخنەگرانی سەرقاڵ کردووە وەك لەپەیوەندی شیعر بەهونەرەکانی ترەوە.

پێویستمان بەوە نییە پەنابەرینە بەر سەرژمێریەك کە چەند ژمارە لەشاعیران لەبارەی وێنەو وێنەکێشەکان و چەندی تر لەبارەی هەڵکۆڵین و هەڵکۆڵیارەکانیانەوە تەلارو کۆشك و وەستاکانیانەوە شیعریان نووسیوە، بەقەدەر ئەوە بزانین کە وەك دوایین هونەر کۆمەڵێك شاعیر جوانترین شیعریان لەم بارەیەوە سروش (ئیلهام)ی سەرچاوەی گرتووە وەك هێلدرین و رامبۆو رالکەرو ستیڤان جۆرج راستیەکان دەمێننەوە لەگەڵ تیشکی دەرکەوتنیان بەوەی کەشیعر پەیامی بەردەوامبوونی لەگەڵ بەردەوامبوونی پەیامی وێنەکانە زیاتر لەهەر هونەرێکی تر، لەهەمو ئەدەبی ئینگلیزیدا شیعرێك نابینیتەوە سەبارەت بەوێنەکەی پێشەنگ تر بێت لەجوانی و سادەیی قسیدەکەی (کیتس) کە لەوەوپێش باسکرا لەبارەی (قاپی ئەفریقیەوە) ئەوە بەسە بۆ ئەو قسیدەیە کە بەم سەرەتایە دەستپێدەکات:

تۆی ئەی بوکی بێدەنگی کەکەس دەستی لێوەنداوی
تۆ ئەی ئەوەی بنیاتی دەنێی بێدەنگی و زەمانی شێنەیی
ئەی سەرگوزشتەی جەنگەڵەکان، ئەی ئەوەی دەتەوێت قسە بکەی
چیرۆکێکی گەشترە زیاتر کاریگەر لەشیعرەکانمان...

هەروەها شاعیر پرسیار لەو ئەفسانەیە دەکات کەوێنەی کێشراوە لەتەنیشتیەوە، ئایا ئەوە خواوەندە یا مەردوم یا پاکیزە قەدەغەکراوەکان، لەبارەی دەرکردنی مەجنون و خۆبەختکردن لەپێناوی راکردندا، مەزامیرو دەفەکان کەگوێ لەدەنگی بەسۆزیان دەگرین لەحاڵەتی مەستیدا، بەگوێی رۆح دەیبیستین نەك بەگوێی هەست، بەوێنەیەکی بینراو دەست پێدەکات لەیەك کاتدا دەیبینین و گوێشی لێ دەگرین، بەم شێوەیە دەیگێڕێتەوە:

لەوێ کوڕێکی لاو هەیە لەژێر دارێکدا دانیشتووە ناتوانێت دەستبەرداری گۆرانیەکەی بێت هەروەك چۆن ئەو درەختە نایەوێت خۆی رووتکاتەوە لەگەڵاکانی ئەوە خۆشەویستیە پردەکانی بەختیاریە چاونەترسی و بەختیاری لەتوانایەکدا هەڵدەقولێت لەیەك کاتدا بۆ هەتا هەتایە، گۆرانی تازە دەڵێت مۆسیقاش دەژەنێت، بەبەردەوامی خۆشەویستی دەکات، ئەو هەر بەجوانی دەمێنێتەوە خۆشەویستیەکەش گەرمتر دادێت گەنجێکە ناوی لەسەروو هەموو سۆزە مرۆڤایەتیەکانەوەیە جوانیەکەشی بەهارانەیەو دەمێنێتەوەو نوێتردەبێتەوە بۆ هەتا هەتایە. ئەو کەشیشە نادیارەی نێو کەژاوەکە کەپێشەوایەتی خۆبەختکردنی کوشتارگەیەك دەکات دەری دەکاتە دەرەوە. دەڵێت:

ئەوانە کێن دێن بۆ خۆبەختکردن؟

بۆ کام کوشتارگەی سەوز، ئەی ئەو قەشەیەی تەمومژ دەپێچێتەوە،

سەرکردایەتی ئەم مانگایە دەکەی کەبۆڕەی بەرزدەکاتەوە بۆ ئاسمان،

هەموو لاتەنیشتەکانی خۆی دەرازێنێتەوە بەکلیلی گوڵەکان؟

کام شارە بچکۆلەیەیە دروستکراوە لەسەر قەراغ رووبار یا کەنار دەریا،

یا لەسەر شاخ، کام قەڵای بێ ترس چواردەورت دەگرێ

ئەو خەڵکانەی چۆڵیان کرد لەم بەیانیە بێ گوناهەدا؟

ئەی شارە بچکۆلەکە، جادەکانت بەبێدەنگی دەمێننەوە هەتا هەتایە

هیچ شتێك نییە بتوانێت بگەڕێتەوە.

پێت بڵێ بۆچی تۆ وێرانەی؟

بەم شێوەیە (کیتس) لەقەسیدەکەیدا درێژ بەلاواندنەوەکەی دەدات و پڕە لەخۆشەویستی ژیان لەچوارچێوەی بێدەنگیەکی ئارامدا ئەو تابلۆیە دەمێنێتەوە لەشیعرەکەدا.

# پەیکەری (برسیەکان)ی

# ئەرنست بارلاخ

یەکێك لەسەرچاوە کاریگەرییەکانی داهێنانی کاری هونەری هاوکات لەگەڵ ئاوێتـە بوون بەستاتیکای هونەر گوزارشت کردن لەوئێش و ئازارو مەینەتیانەی کەکۆمـەڵێ مـرۆڤ توشی مرۆڤەکانی تر دەکەن و کارەساتی بەسەر دێنن.

تابلۆی (ژنە برسیەکان) یەکێکـە لەوپەیکەرانـەی کـە لەگەچ دروسـتکراوە گوزارشـت لـەژان و مەینەتیـەکانی ژن دەکـات ئـەم تـابلۆ هـەلکۆلڕاوە لەسـاڵی ١٩٣٢ لەلایـەن هونەرمەندی تەعبیری و نوسەری شانۆیی (ئەرنست بارلاخ)ەوە دروست کراوە.

ئەم هونەرمەندە کارە هونەرییەکانی بەوەجیادەکرێتەوە کە رۆحێکی پڕئازارو نائومێدو تراژیدییانەی تێدایە بەتایبەتی ئەوکارانەی کەلەسـەردار هـەڵکۆڵیون باشـترین کـاری ئـەم هونەرمەندەن، هاوکـات لەگەڵ گوزارشـتکردن لـەئێش و مەینـەتی و هـەژاری ژن، وێنـەی جوتیـارو بـێ دەرەتانـان و خەڵکـە رەنجـدەرەکان سەرچـاوەی ئیلـهامی کارەکـانی ئـەم هونەرمەندەن بەتایبـەتی ئەوکارانەی لەدوایی ئـەو سـەفەرەوە کێشاونی کەچـووە بـۆ روسـیا لەوساڵانەدا شێوازی ئیشکردنی ئەم هونەرمەندە لەوشێوازانەن کە کاریگەری هـەلکۆلینی قوتیانـەی ئەڵـمانیای سـەدەی رابردویـان پێوەدیـارە.کارەکـانی ئـەم هونەرمەنـدە زۆر لەکارەکانی ژنە هونەرمەنـدی سـەردەمەکەی (کیتـە کـولفیتس)ەوە نزیکـە ئـێش و ئـازاری دایکان و منداڵانی بەرزکردۆتەوە.

وابەستەبونی هونەرەکان بەیەکـەوە کاریگـەریان بـۆ سـەریەکتر بەتایبـەتی کاریگـەری وێنەکێشان و هەلکۆڵین بۆ سـەرئەدەب وایکـردووە پەیکـەری (برسـیەکان)ی بـارلاخ ببێتـە سەرچـاوەی ئیلـهامی شـیعری زۆرێـك لەشـاعیرانی ژن وەك (ئـەلیزابێس ئـەمونتس دریگر) و (ئەنالیزە بونجیرون).

ئەرنست بارلاخ(ernst barlach) لەساڵی ١٨٧٠ لە(لینگورگ)ی ئەڵمانیا لەدایکبووە بەهۆی ئەوی کەکارە هونەرییەکانی دەربڕی ئێش و ئازاری چینەکانی کۆمەڵ بوون زۆربەی پەیکەرەکانی بەدەست نازییەکانەوە شکێنران و لەناوبران تەنها چەند دانەیەکی کەمیان لەمۆزەخانەکاندا پارێزراون بەتایبەتی ئەو مۆزەخانە بچوکەی کەلەشاری(لینبۆرگ) هەبوو بارلاخ لەساڵی ١٩٣٨ ماڵئاوای لەژیان کردووە.

## ئەلیزابیس ئەمونتس دریگر

ئەم ژنە شاعیرە لەساڵی١٨٩٨ لەشاری(کۆڵن)ی ئەڵمانیا لەدایکبووە، زۆربەی ژیانی لەشاری بینرگ بەسەربردووە، خاوەنی یەك رۆمان و کۆمەڵێك کورتە چیرۆکی ترو چوارکۆمەڵە شیعرە ئەم شاعیرە پەیوەندی رۆحی زۆری بەپەیکەرەکانی(ئەرنست بارلاخ)ەوە هەبووە بەتایبەتی دیوانی(دڵە بێکۆتاکان) بیست قەسیدەی لەپەیکەرەکانی(بارلاخ)ەوە ئیلهامی وەرگرتووە لەبەردەم هەر قەسیدەیەکدا بەشێك لەئیلهام بەخشی ئەو پەیکەرانە دەبینینەوە ئەم قەسیدەیە بەشێکە لەودیوانە کەلەساڵی ١٩٧٠ لەخانەی بلاوکردنەوەی مۆسنیر چاپیکردووە.

دایکەبەدبەختەکان

ئێمەکەسانێکی هەژارین

کەساستر لەتوشبونمان بەهەژاری

منداڵە بچوکەکان لەئێمە لەدایك ئەبێت

بەدرێژایی تەمەنمان ئەوەی هەڵمان گرتووە رایدەکێشین

بەرووبووم ئەدەینەوە بەجیهان

بەخوێنی دڵمان تێریان ئەکەین

هەڵیان دەگرین لەشەوی رەحمان

وەك چۆن گوناه هەڵدەگرین

لەرێگاکە دەترسین و

رێگای برسێتیمان سەختە

منالەکانمان لەبەردەم خودادا رادەکێشین

هەموو خەونەکانمان مردوون

هیچ نەماوە

تەنها خەونێکمان نەبێت

لەسنگمانا شاردومانەتەوە

ئەوەعەیبەیە کە هەڵدەگرین

بێ هاوتا بێ هاوتا بارەکەمان قورسە

خۆزگە خودا خۆشی ببارێنێ بەسەرمانداو

یارمەتیمان بدات

بەچکە باڵندەکانیش رزگار دەکەین

لەکارەسات و خەمەکان. (۱)

## ئەنالیزە بۆنجیرۆن

ئەم شاعیرە ژنە لەدایك بووی ساڵی ۱۹۲۳ یەلەشاری ماینس ، فێربوون وراهێنانی یاسایانەی خوێندووە شارەزایی لەبواری کاروباری هاوسەرێتیدا پەیدا کردووە ، هەمووژیانی سەربەستانەبۆ نووسین تەرخان کردووە لە(بیبرش )لەدەورو بەری شاری فیسبادن ژیاوە .

(پەنابەران)یەکێکە لەو پەخشانە شیعریە بەناوبانگانەی کەلەنێو کۆدیوانی ((معبر))دا یە سەرچاوەی ئیلهامی هەموونەم شیعرانە کارە هونەیە هەلکۆلراوەکانی (ئەرنست بارلاخ)ە .

پەنا بەران
بەناو زەمەندا دەگەڕێین
بەبێ نیشتمان
لەهیچ جێگایەکدا هێمنی وئاسایش نابینینەوە ،
هەتا ئاگادارنین لەتیشکی خۆربش ،
لەبەر ئەوەی جیهان گومانی لێمان هەیە
لەشوێنێکدا بەتەنها لەسێبەرێکدا
رایدادەنێیت ئەوە دوزەخە
تەنها لەپشکۆی ئاگرە
دوزەخ لەبەفری تەنهاییە
ئەو ساردییە دلێکی تەنیوە
کێ یادمان دەکات ؟
کێبەزەیی پێماندا دێتەوە ؟
کێ دەپارێتەوە
ئەوەی ئاوساوو مرە
خودا
ئەگەر نانی رۆژێکی بداتێ دەلێت
بەسە تائەمرۆ ؟

ڕوژانی تەنگانەتان بیر چوتەوە

سکی برسی و

ئازاری ڕوح ؟

وەبرینەکانی دوێنێ ئایا سارێژ دەبنەوە

ئەی برینەکانی دوێنێ ؟

چاوی کوێرکردن کەدڵ ئاسایشی

سڵەمیەوە

ویژدانتان داپوشراوە

هەوری درۆ بەسەرتانەوە ئەبوڕێنێ

داماوێکی ماندوو

کوێریتان خوشگوزەرانتان دەکات

چی کوێرتان دەکات ؟

برسێتی برسی بوون لەنزیکەوە

تێربوون هەتا سك ئاوسان

ئایا ڕوژێك زەوقتان هەبووە

ئایا تاقیتان کردوتەوە ؟

چێژی خوشەویستیت بەدەست هێناوە

کە دەپارێیتەوە

لەهەموو نوێژەکانتاندا ..

تا خودا لێتان خوش بێت (١)

# بەشی پێنجەم

# بلانسی نووسینی هاوچەرخی ژن

## نوسەرانی ژنی سەدەی بیستەم وئەو کارانەی لێکتریان جیا دەکاتەوەو کۆیان دەکاتەوە

لەبەرهەمی نووسەراندا کارێك هەیە یان زیاتر کەجیایان دەکاتەوە لەکارەکانی پێشووی ئەوی لەئێستادا دەینوسێت ئەمە دەبێتە ئەوی چێژ وەربگرێت لەدەنگی نووسەرێتی خۆیی بەشێوەیەکی تایبەتی ، یان ڕێگەیەك تایبەت بەخۆی لەنووسیندا دەدۆزێتەوە.

ئەوەش دەگەڕێتەوە دابوو نەریت و پێوەرێك کەلەتاکێتی وبنەما دانان وبلیمەتیدا سەرچاوە دەگرێت ، هەروەها ئەوەشی کەنووسەر لە نووسەرانی تر جیا دەکاتەوە لەگەڵ کلتورو پێوەرەکاندا لەئەدەبی نوێگەرایدا بەرهەمی خوێندنەوەیە ، لەبەر ڕووناکی هەندێك

لێکۆڵینەوەی زمانەوانی ئازاددا دەنگی نووسەر بەوە جیا دەکرێتەوە ئەو کارەی دەیکات لەبەرهەمی پێشووتری جیاوازە لەهەمان کاتدا لەگەڵ کاری نووسەرانی تر جیاوازی هەیە .

دەروازەیەکی هێندە ئارام نیە بۆڕانینی دەقێکی ئەدەبی ، هەندێك دەڵێن ( دەنگی نووسەر) مانای ویست و تێگەیشتنی نووسەر نیە نابێت ببێتە نیەتێك بۆ ڕێژەی چوتییەتی نووسەر ، هەروەکو ڕەخنەگری ئینگلیزی ( لۆرنا ساج ) کەکاری زۆرەی نووسەرە ژنە گەورەکانی سەدەی بیستەمی هەڵسەنگاندووە لەو نووسەرانە ( ئەدی سوارتن و فیرجینا وولف وکاسرین مانسفیلد و سیمۆن دیبوڤوار و ئەیریس ماردۆخ و ئەنجیلا کارتەر هتد ..) سەدەی بیستەم بەنووسینەکانیان شکۆمەندبوویەواتە ڕۆشنایی ڕاستییەکە لەوەدایە کەکرداری نووسین لەسەروو ئاشنابوونیان بەتەنهاییانەوە دەگوزێت ، ڕۆشنایی ڕاستی لەنووسیندا ئەوەیە یان بەشێوەیەکی ڕوونتر کارەکانیان دوور خستوتەوە لەنیەتە ئاشکراکانین وەك هۆیەك بۆلاسایی کردنەوەی ئەدەبی چوونەتە ناو نووسینەوە و تێکەڵ بەکاری نووسین بوون .

هەموونەوپێوەرە نێرینەییانەی کەسەرچاوەو بۆچوونن بەکارهێنانی خۆیەتی و ژن بوون وەك ئالیە تێك لەچیرۆکی نووسیندا قەدەغە دەکەن ، هەروەها هەموونەو باس وخواستانە ی کەهەیەتی تایبەتن بەچەوساندنەوەو دابڕان ، لەحاڵەتی ژندا (دەنگی نووسەر) ئەوەیە نەریتی تاکێتی وبلیمەتی وبنەمادانان دەبنە پێوەرلەبەری لاسایی کردنەوە ی ئەدەبی پێشینە ، بەواتایەکی ترنووسەرە ژنەکە لەتەنهایی و دابڕاندادەمێنێتەوە کردەی ڕۆشن بوونەوە بەنووسن دەبەخشێت ، بۆکۆکردنەوەوجیاکردنەوەی کاری باش لەنێوانیانداهەڵبژاردنی کاری نایاب لەبەرهەمی هەمووبەکێك لەنووسەران خوێندنەوەیان هەیە بۆواقیع وسروشت نمونە لە دژی بەربەرچدانەوەی واقیع لە چیرۆکی ژیانیانداکەخۆیەتیان وەك ڕەگەزێکی ژن گوزارشتی لێدەکەن وئەدەبی تایبەت بەخۆیان دەخوڵقێنن ، وایکردووە بڵێین ئەدەب دابەش بوتەوە بۆژانرێکی تریش کەتایبەتە بەدەنگی ژن ، لەنمونەی ئەوەش (سیمۆن دیبوڤوارە ) تەنانەت بەربەرەکانێی ئەدەبیشی کردووە ، کاتێك کەدەیخوێنیتەوە بەرهەمەئەدەبییەکە ی

بەشێوەیەکی ئەفسانەییانە جارێکی تر کەسایەتی ژن دەسەلمێنێت ، ئەم سیفەتە دژە کردارانە کەدەنووسرێن بێگومان لەهۆشیاری سیاسیانەی ناسنامەی دۆزی ژنەوە گەشەی کردووە لەسەرەتای سەدەی بیستەمدا ، لەگەڵ پێویستی هۆشیاری بەتازەگەریەوە ئەدەبی بێت یا ڕۆشنبیری بەشێوەیەکی گشتی هەموو ئەو ئەقڵە دوا کەوتووچەسپیوەی مێژوولەگەڵ خۆی هێنا بووی بەتوندی بەر پەرچدەدرانەوە ، ئەنجامە تەسکەکەشی ئەوەیە کەنووسەرێکی ژن گیرۆدەی ئەدەبێکی ژنانە دەبێتەوە بەو سیفەتەی کە ژنە ،زۆر کەم ژنێکی نووسەر لەو ڕێگەیە دەردەچێت لەکاری نووسیندا بەپێی ئەو هۆشیاریەی ناسنامەیەکی ژن هەڵیدەگرێت بۆتێگەیشتن لە تازەگەری ئەدەبیدا ، لە و ڕووەوە دەتوانین باوەڕبەرۆمانی (ایتان فروم)ی نووسەری ئەمەریکی (ئەدیس وارتن )بکەین کەبەرهەمێکی ژنانەیە (الخروج بحرا)ی فیرجینا وۆڵف (حفلە الحدیقە) ی نووسەری نیوزلەندی کاسرین مانسفیڵد لەڕیزی کارە نایابەکاندان ، لەگەڵ ئەوەی کەسیفەتی توڕەیی تێدا زاڵە بەشێوەیەکی جیاواز لەپێش هەموو ئەو کارانەی خولگەی ڕۆمانی (ایتان فروم) دەکە لەسەر خولگەیەکی جیاوازتر لەکارەکانی تری ئە دیس وارتن دەسوڕێتەوە کەناوبانگێکی بڕی ئەمەش جیاوازییەکەی لەوەدابوو کەبەرهەمی سووربوون بوولەسەربەخۆبوونی کارەکەو دوورە لەو کۆمەڵگایەی کە بۆی دەگەڕێتەوە ، لەگەڵ ئەوەشدا گومانی تێدا نیە کەگێڕانەوەو شارەزایی ئەو چیرۆکانە ی بۆ هۆشیاری جیهانێکی ڕێك و پێك دەگەڕێنەوەو بەیەك دەگەن لەئاستێکی بەرزدا ، ئەم دەنگە بەهێزانە کەڕەنگ بۆی توڕەیی هەڵدەگرن لەپێشینەی هەموو کارێکی ئەدەبیدان ، بەتایبەت کارێك کە بەرهەمی داهێنانی ژن بێت هەر وەك لەکارەکانی فیرجینا وۆڵف و کاسرین مانسفیڵدا دەردەکەوێت کەلەپێشەوە ناومان هێنان ، چوارچێوەیەکی تۆمارکراوی چیرۆکی واقعی بوون بۆدروست کردنی سرووشتێك لەخانەی خولگەیەکی ئەدەبیدا ، توڕەیی ئەو دەنگانە پەیوەندییەك لەنێوان ڕۆشنبیری وسروشتدا تۆختر دەکاتەوە لەمێژووی مرۆڤایەتیدا ، هەروەها پێشینەی ڕێگایەك بوود بۆپێناسە کردنی سنوری عەقڵانیەتی کۆمەڵایەتی کەهەندێك جار دەشبێتە شوێنەوارێکی ئەدەبی

ڕیالیزمی وسروشتی ، کە دوا کەوتووی دەیسەپێنێت لەهەردووڕۆمانەکەی (ادیس وارتن ) و (فیرجینا وۆلف )وکۆمەڵێك چیرۆکی مانسفیڵدا هەندێك پەردە لادەدەن لەڕووی واقع وئەو شتانەی لە پشتەوەن ، بەشێوەیەکی ڕێك وپێك و تەواو کەو ئەوانەی کەعەقڵانی و واقعی نین کەشفیان کردووە لەگەڵئەوەی ئەم سێ نووسەرە لەکۆمەڵگای دواکەوتوشدا بوون ، جەخت کردنەوە لەسەر پێشەنگی کاری ئەم نوسەرە ژنانە بەو مانایە بووە ژن لەو واقیعە دوا کەوتووە وەگوێزنەوە بۆ واقعێکی پێشکەوتوو تر لەڕێگەی بابەتی ئەدەبی ( ریالیزمی و سروشتی ) و پەخشانە چیرۆکی خۆیەوە بێت یان هەر شتێك مەیلاتی ئەوە بێت و مەرجەکانی یەکسانی بیگرێتەوە بەشێوەیەکی کاریگەر نووسەر وێنای خۆی کێشاوە لەناو پەخشانە چیروك وگێرانەوەی واقیعیدا سەبارەت بەهەموئەو گرێو گۆڵانەی کەسەرچاوەی چەوسانەوەن ، کەواتە پابەند بوون بەکاری نووسینەوە دەبێتە ڕێگایەك بۆ ناسینەوەی وێنەیەکی خۆبەخش لە ژنانی ئەو ڕێگایە کە چەوساندنەوەیە ، ئەوان دەبنە ڕێوان لەڕێگەی داهێنان وتازەگەری و تێگەیشتنەوە لە دلّدا هۆشیارییەکی سیاسی زاڵ دەبێت و پێش تازەگەری وتێگەیشتن لەتازەگەری دەکەون .

ئەوسیفەتانەی نوسەرانی ژنی سەدەی بیست جیا دەکاتەوە ئەو هۆشیاریە سیاسی و تازەگەرییە کەگرتویانەتە بەرو پاشان بوون بەشارەزایی ڕێگای کاری جیاوازو نایاب بۆ نووسەرانی تازەتر ، هەروەك نووسەری بەریتانی ( ئەنجیلا کارتەر ) بەتایبەتی لەکارە سەرکەوتووەکانیدا کارتەر کاتێك لەکاری نووسیندا پابەند بووە بەتێگەیشتنەوە وەك نوسەرێکی ژن بڕوای بەنووسینی ئەدەبێك نەما بووکەدژ بە واقع بێت واتە ئەدەبێك کەبنەمای گوزارشتی و واقیعی و داسەپاندنی پشت بە خەیاڵ دەبەستێت و پەیکەرێك دادەتاشێت لەنووسین کەواقیع نیە بەڵام لەچوار چێوەی دەنگ ورەنگی خەلکدا بووە لەبەردەم تیۆریە تازەگەریەکانیدا وەستاوە چ وەکو ئەدەب ین وەك زانست بەلکو تووشی ئەدەمێکی شەعبی بووە کەلەڕێگەی ئەوەوە ژنی وەك سروشتی خۆی پیشاندا وە بەوەی

کەرەموزن و جاویدا ن ویەنازارە ، ریژەیەکیش لەمەوە بۆ (جولیێت )ی کارەکتەری سەرەکی رۆمانەکەی مارکیز دەگەرێتەوە کەبەناونیشانی (دوساد )بوو ژن وەکویکەرو کرداربشە .

کاری نووسەرە ژنە کانی تر بەوە جیادەکرێتەوە کەسەرپێچیان لەشێوازە ئەدەمیەکە کردووە وەك نووسەری ئەمەریکی (دوجان بارنز)لەرۆمانی ( غابە سوداء) یان رۆمانی (سیدتان جدیتان )ی جین بولز یان لە (السیرة المضادة )ی نوسەری بەریتانی (کریستین بروك ـ روز )یان هەروەك سیمۆن دیبوڤوار لە( الجنس الثاني) بەتێروانینەکانی و سەرپێچی کردن لەئەزمونێکی شێوەیی و گوزارشتی بەشێوەیەکی گشتی قوڵدەکاتەوە سیمون دیبوڤوار بەدژایەتی کردنی ئەدەبی ئەزمونگەری بەناوبانگ بوو ، بۆتەوەش نووسینەکانی بەوەجیا دەکرانەوە لەجیاتی پەخشانە چیرۆك ماکی بیرو باوەری ژنانەی لەو رێگایە دا دەبەخشی بەجۆرێك رەخنەی لەو تێگەیشتنە مێژوویەی سەردەمەکەی دەگرت کەلە نێوان کاری هونەری وجیهانیدا جیاوازیەك هەیە ، ئەدەهات ساڵەکانی تەمەنی هەرزان فرۆش بکات وبیرو باوەریشی پێشکەش بکات بەڵکو بەشێوەیەکی گوزارشتانە ئەو کارەی دەکرد ، بەڵای ئەوەوە خۆرزگار کردن لەدوودڵی کەعەقڵی گونجاووهەستی دروست لەسەری دەروات یەکسان دەبێتەوە بەشێوازە ئەدەمیەکە بارنز وبولز لیستا دوو نمونەی سەرپێچی کردنیان نەئەگەرایەوە بۆ قوڵبونەوە لەئەزمونێکی شێوەیی وگوزارشتی بەشێوەیەکی گشتی ، نووسەرێکی ژنی وەك بروك ـــ روز بەدرێژایی ژیانی داهێنانی لەسەر نووسینی ئەزمونگەری دەروێشت ، بەناو بانگ ترین رۆمانی لەرێگەی گێرانەوەوە نووسیبوو ، بنەماکانی واقیع وپێویستیەکانی ئەو سەردەمە کەبارمتەی دەیداتە دادگایکردنی شێوازی نووسینێکی واقعی ، واتە سەردەم و پێگەیشتنی زەمەنی و کەسایەتی رۆماننوس دیاریکراوە لەگەڵ ئەوەشدا لەچیرۆکە خۆیەتیەکاندا نووسینەکانی زیاتر پەیوەستە بە وەفاداری زۆر بۆداخوازی وخەباتی ژنان لەهەموو تەکنولۆژیای نوێش دەدوێت ، دوابە دوای ئەوە شتێکی نەنووسیوە لەجێگەیەکدا شێوازێکی رەقی پێوە دیار

بێت لە سەرچاوەو چەوساندنەوە ، بەڵام ئەم گووتنانە ڕۆماننووسی بەریتانی ( ئەیرس ماردۆخ ) ناگرێتەوە کەلە گەورە نوسەرانی ژنە لەسەدەی بیستەمدا هەمیشە شانازی بەوەوە دەکردکە (واقیعیە )دژ بەئەزمونی شێوەگەریە لەهونەرو تێوەرە ئەدەمیەکاندا بەخراپ ناوزەندی دەکردن ، نائومێد نەبوولەبنەماکانی گێڕانەوەی ڕاست چیرۆکەکانی درێژە پێدەدا بەو پەڕی توانایەوە پشتی دەبەست بە سەردەم وکەسایەتی ڕۆمانەکانی ، زانایی ئەو ئاشکرایە بیرو باوەڕی ڕاستەو خۆ پەیوەندی بەزەمەنەکەیە وە هەبوو ، بەڵام پەنا بردنە بەر ئەم بنەمایانە مانای ئەوەنیە کەماردۆخ ئەدەمێکی واقعی بەکردار دەنووسێت ، بەڵکوواقیعی بەکاردەهێنا وەك دارشتنی هەر هونەرێك کەئیشی زۆر بۆدەکرێت تازووتر بگاتە هەستی خەڵك ، ئەو بنامایانەی بەکار دەهێنا لەپێناو بەرژەوەندی تیۆریەکی چەسپاو بەوپێیەی هونەر رزگارمان دەکات لەئەشکەوتی ئیفلاتونی بەناو بانگ ، ماردۆخی ئیفلاتونی بڕوای بەشکۆو لەگۆڕدنی نەریتەکان هەبوو ، پێشەنگی دانایی بوو لەپێگەیشتنیا ، لەگەڵ ئەوەی پێچەوانەی ئیفلاتون بوو باوەڕی بەوە بوو کەهونەر بەهێز ترو ڕاستگۆیانە تر کاری هەیە لەدروست کردنی تیۆری جەستەی دانایدا .

سەرچاوە نسایتی

- www.balagh woman_com

# ره‌خنه‌ ی ژنانه‌ له‌نێوان
# فیرجینا وۆلف وژۆلیا کریستفا

ن :عبدالنور ئیدریس

فیرجینا وۆلف له‌یه‌کێك له‌وانه‌بێژیه‌کانیدا ئه‌وه‌ی ده‌وت قورسترین شت که‌تووشی کاری ژنان ده‌بێته‌وه‌ ئه‌وه‌یه‌ که‌بیه‌وێت نووسه‌ربێت ، هه‌روه‌ها له‌م وتاره‌یدا ئاشکرای کرد ئه‌وه‌ی که‌رەنگه‌ ببێته‌یاسایه‌ك له‌ره‌خنه‌ی ئه‌ده‌بیداکه‌رووی پیرۆزی ده‌بێته‌وه‌، رووبه‌رووی دێوه‌زمه‌کان ده‌بێته‌وه‌، رووبه‌رووی سێکس ده‌بێته‌وه‌، ناوێکی باش که‌ده‌توانیت ناوی بنێیت (فریشته‌ی ماڵ)ه‌ واته‌ له‌نێوان ئه‌و وکاغه‌زدا به‌ناوبانگترین شیعر ده‌ستنوێژده‌گریت ، هه‌روه‌ها ده‌ڵێت ئێوه‌ فریشته‌ ی ماڵ ناناسن ، ئێوه‌ ده‌گه‌رێنه‌وه‌ بۆ نه‌وه‌ بچووکه‌ دڵخۆشه‌کان بۆیه‌ وه‌سفی کاری ژنانتان بۆ ده‌که‌م ، ژن وه‌ك خۆی که‌هه‌یه‌ به‌کاری به‌خێوکردنیشه‌وه‌ که‌وه‌سفی ده‌کرێت وای لێکردووه‌ بچێته‌ ناو پیرۆزییه‌ کانه‌وه‌ وه‌ك فریشته‌یه‌کی ناسك وجوان له‌کارنواندندا ،به‌خشنده‌یی خۆ به‌ختکه‌ر له‌ناوهونه‌رێکی قورسدا شت پێشکه‌ش ده‌کات ، که‌هونه‌ری ژیانه‌ ، هونه‌ری ژین له‌ناوخێزانه‌که‌یدا ، له‌سه‌ر مێزی نانخواردن ئه‌گه‌ر خواردنه‌که‌ مریشکی له‌گه‌ڵدابێت بسکتێکی فراوانه‌وه‌ دابه‌شیده‌کات ،ئه‌گه‌ر شوێنێك سارد بوو له‌ژووره‌که‌دا ئه‌و له‌وێدا داده‌نیشێت ، له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌شدا ئه‌وه‌ی که‌لێی بێ به‌شده‌کرێت راو بیروبۆچوونه‌کانیه‌تی ، که‌له‌و رێگه‌یه‌وه‌ ده‌توانێت به‌شداری هه‌ست و بیروبۆ چوونه‌کانی خه‌ڵکی تر بکات ، فریشته‌ی ماڵ لای فیرجینا وۆلف پاکێتیه‌کی بێ ئه‌ندازه‌ یه‌ ، پاکێتی ژن سووربوونه‌وه‌ی ده‌م وچاوتایبه‌تن

بەجوانی ئەو هەموو جوانیەکانی تریش . نووسەری دەچێتەوە سەر ئەو وەسفەی لەدواییەکانی سەردەمی فیکتۆریدا سەبارەت بەژن دەوتران ، وەسفی ژن بەفریشتەی ماڵ دەکرا سەبارەت بەم وێنەیە دەیانگوت کەلەدوای چوونەناو تەمتومانەوە دێت نووسینەکەی دەڵێت : بینیم باڵەکانی دادەناولاپەرەکانی پڕکردەوە ، گوێم لەوێزەی جلەکانی بوولەژوورەکەمدا .فیرجینا وۆلف ژنێتی لەناخی خۆیدا کوشت بۆ ئەوەی نووسینەکانی ئازاد بکات پێچەوانەی هەموو بۆچوونە ئەدەبیەکان بوولەسەردەمەکەیدا ، نووسەرێکی (تێگەیشتوداکۆکیکارو خزمەتی بەمێینەیەتی خۆی دەکرد ) بۆیە ئەو سەردەمە بەسەردەمی لەچاپدانی مۆرکی نووسینەکانی دادەنرێت لەسەررووی مێژوو. خزمەتی بەسیفەتی ڕەگەزی خۆی دەکرد وەك ژن ، ئەولایەنانە گوزارشتی دەکرد کەتایبەت بوو بەبیروبۆچوونەکانی . فیرجینا وۆلف دەرچوو لەپابەندبوون بەشێوازی نوسینەوە لەو سەردەمەدا هەروەها بە بەرگریکردن لە خۆی ودزی ژن بازیدا بەسەر هەموو ڕێچکە ئەدەبیەکانی پێشوو، بەشێوەیەك بەنووسین خۆی بەتاڵ دەردەوە کەهەمووتایبەتمەندی و سیفەتەکانی ئەوی پێوە دیاربوو ، هەرلەم بارەیەوە ڕەخنەگری ژن شوڵتەر ئالان (showalter Elaine) سەبارەت بەسیفاتی نوسینی فیرجینا وۆلف دەڵێت : نووسین لای وۆلف بەردەوام ڕاکردنە لەرەخنەی وەسف ئامێزوهەمیشە تێکەلاوی ڕەت دەکردەوەوڕاکانی خۆی بەتەنها تیۆری وبۆچوون بوون لای ئەو.نووسین لای وۆلف شۆڕشێك بوو کەئەوی پێهەڵدەسەنگێنرا ، پەیوەندییەکی پڕبوو لەترس لەگەڵ چواردەوری خۆیدا بەبوونی کێشەی مادی وفشارخستنە سەری لەرێگەی پەیوەندی وکێشکردنی خەڵك و ئەو شتانە ئاشکرا بلاودەبوونەوە لەسەنتەرەوە بەرەو

قولاّیی سەنتەرێکی تر کاری دەکردە سەریان هەر بۆیە دەبێتە کۆمەڵگەیەك لەتایبەتمەندیەکانی ژن وخەمەکانی [1] .

بەڵاّم سەبارەت بەنوسەرودەروونناس جۆلیا کریستیفا [2] لەو ماوەیەی لەفەرەنسا دەژیا لەساڵی ١٩٦٦دا بەشداری لەچەندان چالاکی ئەدەبی وژناندا کرد بوولەگەڵ کۆمەڵەی (تیل کیل ) وبەناوبانگترین رەخنەگری نوێ کرۆلان بارت وژنەکەی فلیپ سولیریس لەو کتێبانەی کەنووسیویەتی (أبحاث سیمبولوجیة ١٩٦٩، النص الروائی ١٩٧٠، پوره اللغة الشعریة ١٩٧٤، معبرالعلامات ١٩٧٥).

دەقی ئەدەبی لەلای جۆلیا کریستیفا بەگرێچنیەك دادەنرێت بۆ چنینی شتە نەستیەکان (اللاشعوریە) پێچەوانەدەبێتەوە لەدەلالەتێکی بنیا تنراودا ،تینوێتی تەقالیدو نەریتەکان لەسەر میراتیەکی بیروباوەڕ دەبێتە تۆڕیچك لەمنی نووسەردا ، بێستانی دەلالەتەکان لەدەقێکدا پێچەوانە دەبنەوە ،هەروەها (کرۆلان بارت ) یش هەمان ڕای هەیە ، بەڵاّم بیرۆکەکان لەشوێنێکەوە بۆشوێنێکی تر دەگوێزێت [3] . فەیلەسوفیتی ژنانی فەرەنسا لەگەڵ دەستکەوت لەشۆڕشەکە کەبەنوسین بەدەستهیان هێنا تووشی رەخنەی شیعری تازەگەری بوونەوە لەلای (مالارمیەولۆتریامۆن) ، بەڵاّم ئەوان پێیان وابوو شێوازێکی تریان لەنوسین داهێناوە کەپشت بەوتنەوەی جەستە دەبەستێت ورێگەیەکی بۆخۆی بریوە . لەمونامقەشەیەکی تردا کریستیفا ئەوەی دەوتەوە کەهیچ کەس لەرووی بایلۆژیەوە خاوەنی رەگەزی خۆی نیە ورەنگە نەیویستیێ ئەو رەگەزە بێت ، هەروەها بۆچوونی خۆی سەبارەت بەئەدەبی ژنان چڕکردەوەو زیاتر بایەخی دا بە :

یەکەمیان : هەموونەوبەربەرەکانیّ بایلۆژیانەی رەتکردۆوە کە رەگەزی نێرومێ جیادەکاتەوە ،ژن داوای نەخشەی یەکسانی دەکات لەمواقیع وداوایەکیشە بۆ رزگارکردنی راستەقینەی ژن.

دووەمیان : ژن لەبۆچونی خۆیدا هەموونەونیشانانەی سیمای پیاوەتین وپیاوی پێ جیادەکرێتەوە رەتیان دەکاتەوە . بەلاّم تەوەری تایبەتی زانیاریەکانی جۆلیا کریستیفا لەرەخنەی ئەدەبیدا ئەوەیەدابەشبوونی نێرومێ لەئاستی بایلۆژیدا رەت دەکاتەوە . ئەم تایبەتمەندیە زاڵە بەسەر نووسینەکانی کریستیفاوناسنامەکەی دیاری دەکات وەك رەخنەگرێك ، ئەم تێدەگات لەدوانەی پیاو و ژن لەرووە میتا فیزیکیەکەیەوە .

پەراوێزەکان

1-Toril Mol ,Sexuall texual Politics : Femininst Literary Theory Meth uen and co.Ltd in ,1985 , introduction

٢-من اصل بلغاری (صوفیا)متخصصە فی نقد الادب النسائی ،محرکەالتحول بالسیمیا ئیات الفرنسیە ، عچود مجموعە (تیل کیل) تدرس منز ١٩٧٢ بالجامعە الفرنسیە باریس ٧.

3- Toril Mol ,Ibid P:150

سەرچاوە http: llabdenaour.over_blog.net

# فیسوڤا شیمبورسکا

یەکێك لەوژنە نوسەرانەی خەڵاتی ئەدەبی نۆبڵی پێبەخشرالەساڵی (١٩٩٦)لەدوا نـۆ دیوانە شیعری سادەو کاریگەردا شیمبورسکای پۆڵەندییە ، شیمبورسـکا لـە ٢ی تـەموزی (١٩٢٣) دا لەناوچەی (کورنیك)بیچوك نزیك شاری( بوزنان) لـەدایك بـووە ، ئـەم شـارە بەشـەرێتێك بـەناو بانگـە کەکاریگـەری ڕۆشـنبیری ئـەڵمانیای لەسـەرە ، ئـەم ژنەشـاعیرە شیعرەکانی تایبەتمەندی خۆیان هەیە بەوەی کەئاسانە لەفۆرمدا ، بەڵام قوڵ وبەرزن لەتێگـە یشتندا ، لەڕووی واتاوە ڕادەی تێگەیـشتن و هۆشـیاری شـاعیری پێـوە دیـارە بەشـێوەیەك لەبەرهەمەکانیدا کارێکی هونەری گەورە ڕەنگی داوەتەوە کەئێمە نـاتوانین هێلکاریـەکیان بۆبکەین شیعرەکانی دەڕۆن بەسەمامی شیعریەتی خۆیاندا واقیع دەچەسپێنن .

ئەوەی شیمبورسکا دەیویست لەسەر کاغـەز بینوسـێت و هێلکـاری بۆبکێـشێت لـە شیعرەکانیدا ڕەنگ ڕێژی دەکرد هەربۆیە خوێنەرانی نـاوخۆو دەرەوەش لەناوەنـدی شـیعردا تینوی تازەگەریـەکانی بوون ، دەتوانین بەڵگەی قوڵی ئەندێـشەمەندی شـیعرەکانی بەسـێ تەوەر دەسنیشان بکەین ئەویش ئەو فەزا شیعرییە کەئامادەگی هەیە لەشـاعیرەوە بۆشـیعر نووسین و ئـەو بـەر پرسـیارێتییەی کـە خـودی نووسـەر لەئەسـتۆیدایە وئەوبەرپرسـیارێتییەی کەلەئاستی کارێکی هونەریدا دەبێت هەبێت بۆخـود دەگەڕێتەوەهـەروەها ئـەوەی کـەپێی دەوترێت شەیتانی شیعریا جنۆکەی شیعر ئامادەیـە ، ئـەم شـاعیرە شـێتی خـۆی هەیـە ئاژاوەی هونەرەکەی پێ بەرپادەکات ئەو شـێتییەی کـەهیچ زیـانێکی پێناگەیـەنێت ئەگـەر لەئاستی ئافەرید کردنی هونەرەکەیدا بێت و تەنها کاغەز ڕەشکردنەوە و درێژە پێدانی پـڕو پاگەندە نەبێت .

شیمبورسـکا توانیوبـەتی دەسـت پێـشخەرێت لەئافەریـدکردنی کـەژنێك بۆشـیعرو شاعیران لە پۆڵەندا هەرچەندە شاعیرئەوحاڵەتە تایبەتیە ناخولقێنێت بەو پێیـەی بەبۆچـونی زۆر کـەس کـەدەتوانێت نـاوی نەتەوەکـەی بەرزبکاتەوەکەئەمـە زۆر جـار لای شـاعیرانی

نەتەوەکانی تر هەبووە ، لەهەمان کاتدا دەرفەت بەمیزاجی شیعری خۆی نادات کە کارلەبەر پرسیارێتیە گەورەکەی بکات کەشاعیرە ، کەواتە (ئەستێرەیەکەروناکیەکەی دەدرەوشێتەوە لێرەو لەوێ)بوتەوەی شتێکی نوێتر بخاتەسەر تازەگەرییەکانی خۆی بەپێچەوانەشەوە ئەگەر ئەم هەڵوێستە تەنها لەچوار چێوەی شوێن وکاتدا قەتیس بێت ئەوا ئاستی هەلکشانی شاعیروەك تارەزووە هونەرییەکە ورێزگرتنی شاعیر لەخودی خۆی دەوەستێت ، هەروەها بەر لەعەنتێك دەکەون کەشاعیر دەپێکێت وزۆر جار دەتوانین ناوی بنێین کوشتنی چرکەیەکی شیعری!

زۆرجار کەشیعرێکی شیمبورسکا دەخوێنییتەوە توشی سەر سوڕمانت دەکات ، هەر قەسیدەیەك بۆ خۆی بابەتێکی سەرەکی لەپشتەوەیە و بیرو بۆچونێکی سەرەکیشی تێدایە ، شاعیر بۆ خولقاندنی جەستەی هەر شیعرێك وشەیەکی تری پێیە تائەو ڕادەیەی کامەیان نزیکترە لەڕۆح ودەنگەوە و مۆسیقایان تێدایە واتەشیمبورسکا دووتەوەری بنەڕەتی لەشیعرەکانیدا کۆبوتەوە ئەویش هەمەلایەنگری گشتی و تایبەتیە ، کاتێك بەتەنها شیعرەکانی بخوێنیتەوە بەپەلەمیت بوتەواو کردنی و دواتریش بەپەلەمیت بۆ دووبارە خوێندنەوەی ، کەواتەئەگەر بەئاسان بڕوانینە شیعرەکانی فێلکردنە لەخۆمان بەوەی کە بەئاسان ڕووکاری دەرەوەی شیعرەکان دەبینین ، چونکە هوشمەندییەکی زۆر لەشیعرەکانیدا ڕۆچووە بەتایبەت شیعری ((الیقظة ــ ڕابونەوە)) و ((في نهر هیراقلیط ـــ لەڕوباری هیراقلیت )) و((محطة القطار ـ ویستگەی شەمەندەفەر)) گومانی تێدا نیە کەئەم بەرهەمانە دەتوانرێت لەپێشەنگی کارە هونەرییەکان دابنرێت .

شیعرەکانی شیمبورسکا لەڕوی هونەری و بیرمەندییەوە خۆیان داکۆکیکارن لەخۆیان ، دەربڕین لەخزمەتی واتادایە و واتاش دەربڕین ئاشکرا دەکات هەردوکیان یەکشتن بۆ خزمەتکردنی یەك مەسەلە ئەویش قەسیدەیە ، چونکە دارشتن ناگونجێت بەجیا کردنەوەی واتاو دەربڕین لەیەکتری هەروەك چۆن ناتوانین شیعر جیابکەینەوەلەڕێڕەوی خۆی

کەئیستاتیك وناسکیەکەیتی تەنانەت ووتە تەنز ئامێزەکانیش جارێکی تر وەك خودی ووشەیەکی بێ لایەن بۆخزمەتکردنەوەی لایەنە هونەرییەکەی شیعرو بیرو باوەڕەکانی بەکارهاتوون تاچوار چێوەکەی کۆشکی شیعریان پێ تەواو کراوە ، زۆرجار ڕەخنە گرە پۆڵەندییەکان بەبۆچونی خۆیان ئەمە دەگەڕێننەوە بۆتەوەی کەشیمبورسکا لەبورجی ( قرژاڵ )ە .

شیمبورسکا بەدرێژایی تەمەنی داهێنانی کەپەنجاو چوار ساڵی تێپەڕاندووە نۆدیوانی شیعری بەچاپ گەیاندووە یەکەم دیوانی بەناوی ( لەهژاغیا ــ بۆتەوە دەژین )لەساڵی (١٩٥٢ )بەچاپی گەیاندووە دوا بەرهەمیشی (النهایەوالبدایە ــ کۆتایی و سەرەتا ) یە لەساڵی ١٩٩٣چاپکراوە هەروەها کاری زۆر لەنووسەرە بەناوبانگەکانی جیهانی بۆزمانی پۆڵەندی وەرگێڕاوە لەوانەدووبەرهەمی باڵا نمای شیعری فەرەنسی ( دی موسیە )ساڵی( ١٩٥٧) (بودلێر) ساڵی ( ١٩٧٠) لەساڵی (١٩٩١)دا خەڵاتی (گوتەی) پێبەخشراوەولەساڵی(١٩٩٥) داخەڵاتی (هێردر)ی پێبەخشراوە بەو پێیەلەساڵی (١٩٩٦) دا نۆیەمین بوەچوارەمین نوسەری پۆڵەندی بووە لەدوای ( هنریك شیینکیفیچ ــ ١٩٠٥) و(فواد یسواسف ریمونت ــ ١٩٢٤) و( چیسواڤ میوش ــ ١٩٨٠) کەئەو خەڵاتەیان پێبەخشراوە .

سەرچاوە //ڤیسوڤا شیمبورسکا ــ النهایة والبدایة وقصائد اخرى ، ترجمة / هاتف الجنابي

# غەریزەیەك بۆداهێنان ـــ

# كۆمارێك لەخۆشەویستی فروغی فروغزاد

ئەگەر لەبارەی بابەتی ومێژوویی شیعری ژنانەو ڕۆژ هەڵاتیانە بدوێین لەسەدەی ڕابردوودا ، ئەوا ( فروغی فروغزاد ) پێشەنگی ئەو پۆلێنكرنەیە بەپێی ئەو كاریگەرییە هەمیشەییەی هەیبووە لەسەر ژیاری شاعیران بەگشتی وشاعیرانی ژن بەتایبەتی ، لەنووسینە شیعرییەكانیدا دژ بەدیلێتی ژن ناكۆكییەكانی قووڵتر دەكاتەوە ، لەو ڕوانگەیەشەوە بوتە ڕێنوێنی زۆرێك لەئێمەی كوردو ڕۆشنبیرانی ڕۆژهەڵات بەگشتی ، چونكە فروغ شاعیری كاریگەری ئەفراندنی تەوق شكێنی مێژووی ژنە ولەگەڵ نووسینی هەموودەقێكدا ئەگەر لێیی ووردبینەوە توخم وهۆكارەكانی شیعر كاریگەرن لەلای فروغ ، هەر لەووشە ، وێنا ، مانا ، كاریگەری ، واقعیەت ، خەیاڵ ، لوژیك ، زمان و نەریت شكاندن وفەرهەنگ وهەلومەرجی مێژووش ڕەتدەكاتەوە ، بەتوانا وبەهرەی خۆی شارەزایی كاریگەرییانەی لەو توخمانەدا نواندووە ، كەواتە دەبێت لەڕەهەندی نایابی شیعردا دابینێین وپڕبایەخانە لەزەینی شیعری فروغ بڕوانین .

شیعری (یاخیبوون ) یەكێكە لەو شیعرانەی لەكۆمەڵە شیعری ( دیل )ی فروغدا قورسایەكی كاریگەری هەیە لەزەینی خوێنەردا ،

كارێكی ئەدەبی و دەقێكی وەهایە كەشایەنی تێ ڕامانە لەسەر ئاستی قووڵی وداهێنان . لێوانە لەسنوور شكێنی و پڕە لە هەڵچوون

بەرامبەر شكاندنی كوت وزنجیری دابو نەریتی كوتی كۆمەڵگە .

ئەم وێنەیە لەشیعردا لەو سەردەمەدا وەك كارێكی هونەری بەئەزموون دانرا :

لەلێوی من مەدە ،قفڵی خامۆشی

لەدڵدا داستانی نەوتراوم هەیە

لەپێم بکەوە تەنافی سەخت

لەم سەودایە دڵی پڕتوکاوم هەیە (١)

ئەم پرۆسە شیعرییە ئەگەر لەقاڵبی بنیاتێکی جەوهەریدا لێکۆ ڵینەوەی لەسەر بکرێت دەزانین ئەو سەردەمەی فروغ تێیدا ژیاوە سەردەمی کۆمەڵگەیەکی کراوەتر بووە بەبەراوردلەگەڵ سەردەمی شۆڕشی ئێران و کۆمەڵگەکانی تری ڕۆژهەڵات بەتایبەت کۆمەڵگەی کوردی بەهۆی دواکەوتوویی وپەراوێز بوونیەوە زۆر درەنگتر کەوتوتە ناو پرۆسەی ئازادی چین وتوێژی ڕەگەزەکانییەوە بەتایبەتی دوژی ژن

لەڕوانگە تایبەتمەندییەکانەوە لەئاستێکی کەم بایەختردا بووە ، دەتوانین بڵێین لەو کاتەوەی بیرو بۆچونە فەلسەفییەکان هاتوونەتە نێو کۆمەڵگەی ئێمەوە ،ژن وەك هەر چینێکی ترکەوتە هەوڵی چەسپاندنی ئازادییەکان بۆخۆی و ڕەنگدانەوەی ئەدەبی ئازادیخوازانەی ژن لەلای شاعیرە ژنەکانی کورد سەریهەڵدا .

لەگەڵئەوەی باس لەڕەوتی ئازادیخوازانەی فروغ گرنگە ،دەبێت باس لەو کۆمارە خۆشەویستیە بکەین کە فروغ هەیبووە بەرامبەر خۆشەویستەکەی (پەروێز شاپوری ) و بەرامبەر بەکوڕەکەی (کامیار ) ، لەزۆربەی هۆنراوەکانیدا ئاماژەی بەخۆشەویستی ( کامیار ) داوە ،بەڵام سەبارەت بەخۆشەویستی بۆ( پەروێز) ی هاوسەرو خۆشەویستی لەشیعری ( دیوارو ئەسیرو عوسیان ) یەکلایەنە ئەو خۆشەویستی دەردەبڕێت ،هەر لەبارەی خۆشەویستی بۆ پەروێز شاپوری زیاتر لەنامە ئەڤینداریەکانیدا دەر دەکەوێت کە لەکتێبی ( یەکەمین ترپە عاشقانەیەکانی دڵم )ئەو نامانەی فروغی تێدا کۆکراوەتەوە ، نامە سەرەتاییەکانی فروغ ودوایین نامەکانی کەدوای تێپەڕبوونی ماوەیەکی زۆر لەجیابوونەوەی لە( پەروێز) ی هاوسەری نووسیویەتی ، یەکلایەنە سوزو خۆشەویستی بۆ دەردەبڕێت لەکاتێکدا غیرەتی پیاوانەی(پەروێز)ە وادەکات چیتر فروغ ئارەزووی ئەو نەسیریە

خێزانییەی نەمێنێت ، لەهەموو لە مپەرو ئاستەنگێك پێزارە كەدێتە سەر رێگای نووسینی ، هەر بۆیە لەگەڵ ئەو هەموو خۆشەویستییەی بۆ ( پەروێز ) یش هەیەتی داوای جیا بوونەوە دەكات ، پەروێز شاپوور دوای فروغ ژن ناهێنێتەوە و تاكوتایی ژیانی لەگەڵ ( كامیار ) ی كوڕی و دكتور خەسرەو شاپوری برایدا دەژی (۲) .

زۆرجار شێوازی شیعری غەزەل لەنێوان شاعیرانی ژن وپیاودا لەشێوەی جەدەلێكی عاشقانەدا تاڵو گوۆڕكراوە ، هەروەك ئەمە لەلای شاعیرە عەرەبەكان زۆر باو بووە لەرابردووی سەدەكانی پێشوودا ، هەروەها لەنێو كوردیشدا لەنێوان مەولەوی و ئامینە خانم و لەنێوان مەستورەو خەسرەو خاندا هەمان رێو رەسمی خۆشەویستی هەبووە ، بەڵام لەنێوان فروغ و پەروێز شاپوریدا ئەمە نەبووە ، لەگەڵ ئەوەی پەروێزنووسەر بووە و( فروغ ) یش تادواهەناسەكانی لەگەڵ شیعردا سەری ناوەتەوە ، تەنها لەرێگەی نامە ئەوینداریەكانیەوە ئەو عەشقەدەردەكەوێت ، لەشیعرەكانیدا فروغ زیاتر تەوقی دیلێتی دەشكێنێت ، هەر لەم روانگەیەوە یەكەمین ژنە لەگۆڕەپانی شیعری ژناندا پێش ئەوەی پەیڤێكی عاشقانە بلێت داهێنانی دەر دەكەوێت ، كەچی شیعرەكانیشی رۆمانسیانە دێنە بوون .

ئەوەی لەمنا حەشارە ، دەریایەكە
كەی ئەتوانم بیشارمەوە
لەگەڵ تۆ لەم رەشەبا گرانە
بریا توانیبام ، بیلێمەوە
هێندە پڕم لەتۆ ، دەخوازم
بڕۆم و لەنێو سەحراكان
سەر بسوێم لەبەردی كوێستان
لەش بدەم لەشەپۆلی دەریاكان

بیری ئازادیخوازانە پێش ئەوەی بەشێوە ی دەق بێتە بوون وشێوەیەکی تەعبیریانە لەخۆبگرێت ، لەهەموو سەردەمێکدا لەرەوتێکی بەهێزدا زاڵ دەبێت بەسەر بیرو بۆچوونی دواکەوتواندا سەرئەنجام بە شوێن کاریگەرییە هونەرییەکانی خۆیدا دەگەرێت چ ئەدەب بێت یا هەر هونەرێکی تر بەپێی گەشەی رۆشنبیری و زانستی کەسی داهێنەر رەنگ دەداتەوە و دەگۆرێت ، داهێنانی فروغ لەشیعردا ئاوەڵایە لەئازادی و هێزی داهێنەرانەشی تێکەڵە لەئایدیا ورۆشنبیری وئەو ژینگەیەی مامەڵەی نووسینی تیدا دەکات .

ئەمە منم

ژنێك تەنیا

لەبارەگای وەرزێکی سارد ،

لەسەرەتایی (دەرك ) ی جەوهەری ئالودەی زەوین و

ناهومێدییەکی سادەی خەمباری ئاسمان و

بێهێزی ئەو دەستە چیمەنتۆیانە

کات تێپەربوو

کات تێپەربوو ،

و کاتژمێر چوار جار لێی دا . (٣)

لەرووی هونەری و رەوانبێژییەوە ، ئەو زمانە شیعرییەی فروغ پێی نووسیوە زمانێکی تەرو پاراوە ولەرووی رەوانبێژییەوە تۆکمەیە و وێنای شیعری جوان تێیدا خولقاوە ، کەواتە فروغ بەراستی پەساپۆرتی شیعری هەڵگرتووە و بەرابەری شیعری ژنانە دادەنرێت ، لە نێو نەتەوەکانی رۆژ هەڵاتیشدا پەنجەرەیەکی تاقانەبوو بۆ گوزەر کردنی رووناکی و دەرباز بوونی بەشێك لەپێنتە تاریکەکانی ترس .

## پەراوێزەکان :

١. گۆڤاری سپی تر ،ژ ـ ٣

٢. گۆڤاری پێشەنگ ،ژ ـ ١١

## سەرچاوەکان :


١. دیل ـ کۆمەڵێك شیعر( فروغی فروغزاد ) ،و/ جەهانگیر غەفاری

٢. یەکەمین ترپە عاشقانەییەکانی دلّم ـ نامەکانی فروغی فروغزاد ،و/ ئەبوبەکر قەرەداغی

٣. ئیمان بێنن بەسەرەتای وەرزی سارد ـ کۆمەڵێك شیعر (فروغی فروغزاد ) ،و/ جەهانگیر غەفاری

